# رەواندنەوەی گومانەکان

رەواندنەوەی گومان لە سەر پرۆسە هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەر و
هەندێك لەو فەرموودانەی لە سەر ئافرەتان گوتراون



د. خالید موحەممەد سالح

له بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کۆمەڵ

ژمارە (١٢)

# رەواندنەوەی گومانەکان

## رەواندنەوەی گومان لەسەر پرۆسە هاوسەرگیریەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەندێك لەو فەرموودانەی لەسەر ئافرەتان گوتراون

د. خالید موحەممەد ساڵح

چاپی یەکەم

١٤٣١ی کۆچی — ٢٠١٠ی زاینی





* ناوی کتێب: ڕەواندنەوەی گومانەکان.. ڕەواندنەوەی گومان لەسەر پرۆسە هاوسەرگیریەکانی پێغەمبەر ﷺ و هەندێك لەو فەرموودانەی لەسەر ئافرەتان گوتراون.

* نووسینی: دکتۆر خالید موحەممەد سالح.

* لە بڵاوکراوەکانی: ڕۆژنامەی کۆمەڵ، ژمارە (١٢).

* لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی (١٣٢٣)ی پێ دراوە.

* تیراژ: (١٠٠٠) دانە.

* چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٠.

* چاپخانە: شڤان.

* تایپ: گۆران عوسمان.. هەڵەچن: سەلاح سالار، موحەممەد جەمال.

* نەخشەسازی ناوەوە: ئارام شوانی. نەخشەسازی بەرگ: ڕەوشت موحەممەد.

# پێشەکی

سوپاس و ستایش بۆ ئەو خودایەی کە ئەم بوونەوەرەی لە نەبوون هێناوەتە بوون و ئێمەی ئادەمیزادی تێدا کردووەتە جێنشین و میراتگر، هەموو هۆکارێکی ئاسوودەیی و بەختەوەری تێدا بۆ فەراهەم کردووین، نیعمەتی عەقڵ و ژیریی پێ بەخشیوین، تا لە سەرجەم گیانلەبەر و بوونەوەرەکانی تر جیامان بکاتەوە، بەردەوام بەرنامە و فروستادەکانی خۆی بۆ ناردووین تا لاڕێ و گومڕا نەبین. درووود و بەزەیی پەروەردگار بۆ سەرگیانی پاکی سەروەر و پێشەوای مرۆڤایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ، بەتایبەتی و سەرجەم یاران و شوێنکەوتوانی بەگشتیی.

بەڕێزان: هەر چەندە ئەو تەوەرە و لایەنانە زۆرن کە ناحەزان تیر و توانجی خۆیانی لێوە ئاراستەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن، بەڵام ئێمە لەم پەڕتووکەدا لەبەر کەمی ماوە و گرنگی هەندێك لەو تەوەرانە، تەنیا دووان لەو تەوەرانە دەکەینە ئامانج و بە وردی قسەیان لەسەر دەکەین:

تەوەرەی یەکەم: پەیوەندی هەیە بە هەڵسوکەوت و رەفتارەکانی پێغەمبەر ﷺ، کە ئەم تەوەرەیە زۆر جار دەکرێتە ئامانجی ناحەزان و لە رێیەوە و لە بیری نەخۆشیانەوە تیری ژەنگاوی و ژەهراوییان ئاراستەی کەسایەتی پێغەمبەر ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەکەن، زەقترین بابەتیش کە لەم لایەنەوە قسەی زۆری لە سەر دەکەن، زۆر جار بێئاگایانە و بێشەرمانە و دوور لە هەموو راستی و پێوەرێکی زانستی دەیورووژێنن، پەیوەندیی هەیە بە خێزانەکانی پێغەمبەرەوە ﷺ.

جا چ له رووی چەندێتییانەوە بێت، کە پێغەمبەری خودا ﷺ چۆن و بۆ لە چوار ژن زیاتری هێناوە؟

یان لە رووی چۆنێتییانەوە بێت، کە چۆن و بە چ پێوەرێك، بۆ چ مەبەستێك ئەو ژنانەی هێناوە؟

ئێمە لێرەدا و لە تەوەرەی یەکەمدا تیشك دەخەینە سەر ئەم لایەنەی ژیانی پێغەمبەری خودا ﷺ کە بەلای ئێمەی باوەڕدارەوە سەروەری، شکۆمەندی، بەهرەکانی، ئەم لایەنەی ژیانیشی ﷺ ئەگەر لە لایەنەکانی ژیانی دیکەی زیاتر نەبن کەمتر نین.

تەوەرەی دووەمیش: پەیوەندی هەیە بە گوفتار و هەندێك لە فەرموودەکانییەوە ﷺ، بەتایبەتییش هەندێك لەو فەرموودانەی کە پەیوەندییان بە ئافرەتانەوە هەیە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە هەندێك دەقمان هەیە لەو بارەیەوە واتاکانیان کەمێك ئاڵۆزن، خەڵکانێك بە نەزانی و کۆمەڵێکیش بە زۆرزانی راڤەی ناشیاویان بۆ دەکەن، وا باسی دەکەن کە ئەو دەقانە سوکایەتیئامێزن بەرامبەر بە ئافرەتان، لە کاتێکدا جەوهەری دەقەکە ئەگەر وەك پێویست و لە هەموو رووەکانییەوە سەیر بکرێت و روون بکرێتەوە بە پێچەوانەوەیە.

گرنگی ئەم پەڕتووکە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە وەڵامێکی زانستی و بابەتیانەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی کە بەشوێن راستیی رووداوەکاندا دەگەڕێن و هەوڵ دەدەن وەك چۆن روویان داوە، یان گوتراوە ئاوا لێی تێ بگەن، نەك وەك خەڵکانێك کە بۆ مەرامی بەدی خۆیان بە ئاوەژووەوە باسیان لێوە دەکەن. ئەوپەڕی هەوڵم داوە وەکو توێژەرێك بەشێوەیەکی بابەتییانەو دوور لە هەموو سۆزێك، یان کاردانەوەیەك قسە لە سەر بابەتەکان بکەم، لە پێناو بەرجەستەکردنی ئەم بنەمایەشدا ئەم چەند خاڵەم گرتوەتە بەر:

- بۆ زیاتر تۆکمەکردن و بە پێزیی بابەتەکان و پشتئەستوربوون لە راستیی و دروستییان، هەر فەرموودەیەك کە ویستبێتم قسەی لەسەر بکەم، سەرەتا

گەڕاومەتەوە سەر هەموو سەرچاوە رەسەنەکانی فەرموودە، هەتا تەواو دڵنیا نەبوویم لە دروستیی فەرموودەکە لە هەموو روویەکەوە باسم نەکردووە، سەرچاوەی هەموو فەرموودەکانیشم لە پەراوێزدا تۆمار کردووە.

- سەبارەت بە رووداوەکانیش هەمان خاڵم پەیڕەو کردووە، بەڵام لە بەر ئەوەی زۆرینەی بابەتەکانی پەرتووکەکە هەمووی رووداون، نەدەکرا بەهەمان شێوەی فەرموودەکان لە پەراوێزدا باسی سەرچاوەکانی بکەم، هەر بۆیە لەبەر زۆری رووداوە مێژووییەکان لە پەراوێزدا ئاماژەم بە سەرچاوەکانی نەکردووە، بەڵام پاشتر لە پێڕستی سەرچاوەکاندا ئاماژەم بە هەموو ئەو سەرچاوانە کردووە کە پشتم پێ بەستوون، هەموویان سەرچاوەی رەسەن و باوەڕپێکراون.

ـ هەر سەبارەت بە رووداوە مێژووییەکان، زۆر بەدەگمەن رێم لە رووداوێك کەوتووە کە زانایان بە کۆی دەنگ رایان لە سەر بووبێت، بە تایبەتیش لە شتە لاوەکیەکاندا، وەك بەرواری لە دایکبوون، یان مردنی کەسێك، یان شوێنی رووداني کارێك، بگرە لە مەڕ هەر رووداوێك لەم رووداوانە چەندین بۆچوونی جیاوازی لەسەر هەبووە، بەڵام من ئەوپەڕی هەوڵم داوە لەبەر ئاڵۆز نەکردنی بابەتەکان و سەر لێتێکنەدانی خوێنەری بەڕێز، تەنیا رای پەسەند باس بکەم و بابەتەکە و خوێنەریش لەو هەموو ئاڵۆزی بۆچوونە جیاوازانە رزگار بکەم.

- جگە لەوەی کە دەقی هەموو فەرموودەکانم وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، هەر وشەیەکی عەرەبی ئاڵۆزیشم بەکار هێنابێت دیسانەوە لە پەراوێزدا بە کوردیی راڤەم کردووە.

ـ لە بەر رەوان خوێندنەوەی ناوەکان هەوڵم داوە سەرجەم ناوەکان لە سەرەتای باسکردنیاندا بە پێی رێزمانی عەرەبی بیاننووسمەوە، پاشتر بە رێزمانی کوردی نووسیومەتەوە، ئەگەر ناوێکیش بە کوردیی دارشتنەوەی قورس بووبێت ئەوە هەر بەپێی رێزمانی عەرەبی داڕشتنم بۆ کردووە.

له كۆتاییدا به پێویستی دەزانم كه زۆر سوپاسی ئەو كەسانه بكەم كه شایەنی سوپاسن و ئەركیان لەگەڵ ئەم بەرهەمەدا كێشا، كه ئەوانیش به گشتی برایانی ستافی رۆژنامەی (كۆمەڵ) بوون كه له ستوونێكی تایبەتدا و له ماوەی (٣٧) زنجیرەدا و له ژمارەكانی (٣٥٩_٣٩٧)ی رۆژنامەكەیاندا بابەتەكەیان خستە بەر دیدەی خوێنەری بەرێز، پاشتریش ئەركی بەچاپ گەیاندنیان گرتە ئەستۆ، به تایبەتییش هەر دوو برای بەڕێزم كاك (هاوژین عومەر) و كاك (ڕەوشت موحەممەد) كه زیاتر لەگەڵی ماندوو بوون، خوای گەورە پاداشتی هەموو لایەك بداتەوە.

د. خالید موحەممەد ساڵح

سلێمانی/ چوارباخ

١٦/ذو الحجة/ ١٤٣٠

٢٠٠٩/١٢/٣

## خێزانی یەکەم:

ـ ناوی خاتوو: (خَديجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدِ بْنِ أسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى)یـە، دایکیـشی نـاوی (فاطِمَةَ بِنْتِ زَائِدَةَ بْنِ الْأَصَمِّ)ە.

ــ خـاتوو خەدیجـە یـەکێك بـووە لـەو ئافرەتانـەی کـە لـەناو قورەیـشدا بـە رەوشتبەرزیی، ژیریی، قسەزانی، دەوڵەمەندی ناسـراو بـووە، لـە بـەر داوێنپـاکی و رەوشتبەرزی نازناوی (الطاهرة)ی لیٚ نرابوو.

ـ بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبـەر ﷺ، خـاتوو خەدیجـە دوو شـووی تـری کردووە، شووی یەکەمیان بە (عَتِيقَ بْنَ عَائِذ) بووە، شـووی دووەمیـشیان بـە (أبُـو هَالَةَ التَّميميُّ) بووە.

ـ سەرەڕای ئـەوەی کـە بێـوەژنیش بـووە و تەمەنیـشی هـەبووە، بـەڵام لەبـەر رەوشتبەرزی چەندین کەسـی نـاودار و خـاوەن هـۆز و سـامان و دەسـەڵات داوایـان کردووە، بەڵام ئەو شووی بەکەسیان نەکردووە.

ـ لە تـەمەنی چل سـاڵیدا و لەبـەر سەرڕاسـتی و دەسـت پـاکی و رەوشـتبەرزی پێغەمبـەر ﷺ، خـاتوو خەدیجـە مـاوەڵێکی خـۆی بـە نـاوی (نَفِيسَةَ بِنْتَ مُنيـة) دەنێرێتە لای پێغەمبەر ﷺ و پێی رادەگەیەنێت کە ئەو ئامادەیە شووی پیٚ بکـات ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ بیەوێت.

ــ پێغەمبــەری خـودایش ﷺ داواکـەی خـاتوو خەدیجـە رەت ناکاتـەوە و لـە تەمەنی بیست و پێنج ساڵیدا هاوسەرگیری لەگەڵ دەکات.

ـ پێغەمبەری خودا ﷺ بەر لە خاتوو خەدیجە هیچ خێزانی تری نەبووە.

ــ مـاوەی نزیکـەی بیـست و پێـنج سـاڵ ژیـانی هاوسـەرییان بـەردەوام بـووە، پێغەمبەری خودا ﷺ لەو ماوەیەدا هیچ ژنی تری بەسەر خاتوو خەدیجە نەهێناوە.

ـ پاش ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ نیگای لە ئاسمانەوە بۆ دێت و دەبێت بە پێغەمبـەر ﷺ، خـاتوو خەدیجـە یەکـەم کـەس بـووە کـە بـاوەڕی بـە پـەیام و پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ هێناوە.

ـ لە ماوەی ژیانی هاوسەرییاندا خوای گەورە سێ کوڕ و چوار کچی پێ بەخشیون:

کوڕەکان بە ناوەکانی (قاسم) کە یەکەم منداڵیان بووە و پێغەمبەری خودا ﷺ بە نازناوی ئەوەوە بانگ کراوە بە (أبا القاسم) پاشان: (عبد الله) و پاشتر (طیب، یان طاهر).

کچەکانیش بە ناوەکانی: (زَیْنَب)، (رُقَیَّة)، (أُمَّ کُلْثُوم) و (فَاطِمَة).

ـ خاتوو خەدیجە هەر لە مەککە سێ ساڵ بەر لەوەی پێغەمبەر ﷺ کۆچ بکات بۆ مەدینە لە مانگی رەمەزاندا و لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵییدا کۆچی دوایی کردووە، تەرمی پیرۆزی لە (الحجون) بەخاك سپێردراوە، ئەوکات پێغەمبەری خودا ﷺ تەمەنی پەنجا ساڵان بووە.

ـ خاتوو خەدیجە یەکێك بووە لەو خێزانانەی کە رۆڵێکی زۆر گرنگ و بەرچاوی بینیوە لە سەرخستن و پشتگیریکردن لە پێغەمبەری خودا ﷺ و بانگەوازەکەی، بەتایبەتی لە سەرەتاکانی بانگەوازدا، هەر بۆیەیش کە خوای پەروەردگار هەر لە ژیانیدا مژدەی بەهەشتی پێ داوە، ئەبوهورەیرە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: {أَتَى جِبْرِيلُ النَّبِيَّ ﷺ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّه ﷺ هَذِهِ خَدِيجَةُ قَدْ أَتَتْ مَعَهَا إِنَاءٌ فِيهِ طَعَامٌ وَشَرَابٌ، فَإِذَا هِيَ أَتَتْك فَاقْرَأْ عَلَيْهَا السَّلَامَ مِنْ رَبِّهَا، وَبَشِّرْهَا بِبَيْتٍ فِي الْجَنَّةِ مِنْ قَصَبٍ لَا صَخَبَ فِيهِ وَلَا نَصَبَ}[1]. واتە: جبریل هاتە خزمەتی پێغەمبەری خودا ﷺ و پێی فەرموو، ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەوە خەدیجەیە هات، خوانێکی پێیە خواردن و خواردنەوەی تێدایە، ئەگەر گەیشتە لات، پێی رابگەیەنە کە خوای

[1] - البخاري (محمد بن إسماعيل البخاري)- صحيح البخاري- ج٣/ص١٣٨٩- كتاب (٦٦) فضائل الصحابة/ باب (٥٠) تزويج النبي ﷺ خديجة وفضلها رضي الله عنها- ط٣/١٤٠٧- الحديث (٣٦٠٩) تحقيق: مصطفى ديب البغا. مسلم (مسلم بن الحجاج بن مسلم)- صحيح مسلم- ج٧/ص١٣٣- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١٢) فَضَائِلِ خَدِيجَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله تعالى عنها-دار الجيل/ بيروت- الحديث (٦٤٢٦).

پەروەردگار سەلامی لێ دەكات، مژدەیشی بدەرێ بە كۆشكێك لە ئەڵماس و مرواری لە بەهەشتدا كە نە ناخۆشی و نە نەخۆشی تێدا نابینێت.

ـــ هەروەها پێغەمبەری خوا ﷺ زۆر خۆشی ویستوە و تەنانەت دوای وەفاتیشی هەر باسی چاكە و یادەوەرییەكانی كردووە و هەمیشە كەس و كار و دۆستان و خزمەكانی لە بۆنەكاندا بەسەر كردوونەتەوە و بە باشترین ئافرەتانی سەر زەوی ناوی بردووە و فەرموویەتی: {خَيْرُ نِسَائِهَا مَرْيَمُ بِنْتُ عِمْرَانَ، وَخَيْرُ نِسَائِهَا خَدِيجَةُ بِنْتُ خُوَيْلِدٍ}[2]. واتە: باشترینی ئافرەتانی ئەم سەرزەوییە، خاتوو مەریەمی كچی عیمران و خاتوو خەدیجەی كچی خوەیلدە.

ـ تەنانەت پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندەی باس دەكرد و وەسفی دەكرد، تا ئەو ئاستەی كە خاتوو عائیشە دەفەرموێت: {مَا غِرْتُ عَلَى امْرَأَةٍ مَا غِرْتُ عَلَى خَدِيجَةَ وَلَقَدْ هَلَكَتْ قَبْلَ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي بِثَلَاثِ سِنِينَ لِمَا كُنْتُ أَسْمَعُهُ يَذْكُرُهَا}[3]. واتە: هەرچەندە خاتوو خەدیجە سێ ساڵ بەر لەوەی من ببمە خێزانی پێغەمبەر ﷺ كۆچی دوایی كردبوو لە ژیاندا نەمابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە باسی دەكرد و یادی دەكرد، ئەوەندەی لەو غیرەم دەكرد لە هیچ خێزانێكی تری پێغەمبەر ﷺ ئەوەندە غیرەم نەدەكرد.

---

٢ - البخاري- صحيح البخاري- ج٣/١٢٨٨- كتاب (٦٦) فضائل الصحابة/ باب (٥٠) تزويج النبي ﷺ خديجة وفضلها رضي الله عنها- الحديث (٣٦٠٤). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٣٢- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١٢) فَضَائِلِ خَدِيجَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله تعالى عنها- الحديث (٦٤٢٤).

٣ - البخاري- صحيح البخاري- ج٥/٢٢٣٧- كتاب (٨١) الأدب/ باب (٢٣) حسن العهد من الإيمان- الحديث (٥٦٥٨). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٣٣- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١٢) فَضَائِلِ خَدِيجَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رضي الله تعالى عنها- الحديث (٦٤٣٠).

## خێزانی دووەم:

- وەفاتی خاتوو خەدیجە (ڕەزای خوای لێبێت)، بۆشاییەکی گەورەی لە ژیانی پێغەمبەری خوادا ﷺ دروست کرد، چونکە بە وەفاتی ئەو، پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی زۆر خۆشەویست و دڵسۆزێکی بێوێنە و پشتیوانێکی بەئەمەکی لەدەستدا، کە هەر لەسەرەتای بانگەوازەوە هاودەم و هاوخەمی بوو، لێبڕاوانە خۆی ماڵ و منداڵ و سەروەتی خستبووە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و بانگەواز و ئایینەکەیەوە.

- ئەمە جگە لەوەی کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە خاتوو خەدیجە پاش وەفاتی خۆی، شەش منداڵی بێکەسی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ بەجێ هێشت، کە چواریان کچ بوون، پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر سەرقاڵی بەکاری بانگەوازەوە نەیدەتوانی وەکو پێویست بەدەمیانەوە بێت و نازیان بکێشێت.

- پاش ماوەیەك لە کۆچی دوایی خاتوو خەدیجە، لە ژێر فشاری بێنەوایی و بێنازی منداڵەکانیدا و سەرقاڵی خۆی بەکاری بانگەوازەوە، بۆ جاری دووەم بڕیاری ژیانی هاوسەرگیرییەکی نوێ دەدات، خێزانی دووەمی ئافرەتێك بووە بە ناوی خاتوو: (سوودةُ بنتُ زَمْعَةَ بن قَيْسِ بن عَبْدِ شَمْسِ بن عَبْدِ وُدٍّ). دایکیشی ناوی (الشَّمُوس بنت قَيس بن زيد) بووە.

- بەر لە پێغەمبەری خودا ﷺ، خاتوو سەودە خێزانی ئامۆزایەکی خۆی بووە بە ناوی (السَّكْرَانِ بْنِ عَمْرو بْنِ عَبْدِ شَمْسٍ) لەو هاوسەرگیرییەی شەش منداڵی هەبووە.

— خاتوو سەودە یەکێك بووە لەو باوەڕدارانەی کە هەر لەسەرەتای بڵاو بونەوەی دەنگۆی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە باوەڕی بە بانگەوازەکەی پێغەمبەر ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێناوە، لەو پێناوەشدا تووشی نارەحەتی و چەوسانەوەی زۆر هاتووە، لەگەڵ مێردەکەی و چەندین باوەڕداری تر بە ناچاری مەککەیان بەجێ هێشتووە و بەرەو حەبەشە کۆچیان کردووە.

ـ پاش ماوەیەك و كاتێك بیستیان كە بێباوەڕانی قورەیش دەستیان لە ئازاردان و چەوسانەوەی باوەڕداران هەڵگرتووە، لەگەڵ مێردەكەی و چەندین باوەڕداری كۆچكردووی تر گەڕانەوە شاری مەككە، لەمەككەدا هاوسەرەكەی وەفاتی كرد و ئەمیش بە شەش منداڵەوە بێكەس و بێلانە ماوەتەوە.

ـ پێغەمبەری خودا ﷺ وەكو وەفادارییەك بۆ بەئەمەكی و لێبڕاوی خاتوو سەودە، لەپێناو پەنادان و رزگاركردنی لە چنگی چەپەڵی بێباوەڕان و دڵدەدانی خۆی و منداڵەكانی و لەسەر پێشنیاری (خَوْلَةُ بِنْتُ حَكِيمِ بْنِ الأَوْقَصِ) و لە ساڵی دەی پێغەمبەرایەتیدا بڕیاری هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو سەودە داوە و ژیانی خێزانی لەگەڵ پێك هێناوە.

ـ لە تەمەنی پەنجا و یەك ساڵیدا پێغەمبەری خودا ﷺ هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو سەودەدا كردووە، ئەوكات خاتوو سەودە تەمەنی شەست و شەش ساڵان بووە، واتە ئەم خێزانەیشی دیسانەوە زیاتر لە پازدە ساڵ تەمەنی لە خۆی گەورەتر بووە، هەر بۆیەیش ئەم هاوسەرگیرییەی زۆر جێی سەرسوڕمانی بێباوەڕانی قورەیش و خەڵكی مەككە بوو، چونكە هەرگیز باوەڕیان نەدەكرد كە پێغەمبەری خودا ﷺ ئافرەتێكی وەك خاتوو سەودە مارە بكات، كە بێوەژنێكی هەژاری بێكەسی بەساڵاچوو بوو، بڕێك منداڵیشی هەبوو.

ـ ماوەی نزیكەی چوار ساڵ پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو سەودە ماوەتەوە و هیچ هاوسەری تری بەسەر نەهێناوە، هەرچەند لەو ماوەیەدا خاتوو عائیشەی مارە كردووە (رەزای خوای لێ بێت) بەڵام نەیگواستووەتەوە تا كۆچی كردووە بۆ مەدینە.

ـ خاتوو سەودە ئەوەندە ئافرەتێكی خواناس و بەخشندە و میهرەبان بووە، خاتوو عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) دەربارەی فەرمویەتی: (مَا رَأَيْتُ امْرَأَةً احَبَّ

اَلَیَّ انْ اكُونَ فِی مِسْلاخِهَا مِنْ سوودَةَ بِنْتِ زَمْعَةَ)[٤]. واتە: هیچ ئافرەتێكم نەبینیوە حەز بكەم لەو بچم و وەك ئەو وابم، ئەوەندەی حەزم دەكرد لە خاتوو سەودە بچم و وەك ئەو وابم.

- پاش ئەوەی كە خاتوو سەودە زۆر بەساڵاچووە، تەمەنی لە هەشتا ساڵ نزیك بووەتەوە بە پێغەمبەری خودا ﷺی گوتووە: من لەمەو دوا كارێكم بە پیاو نەماوە –دیارە مەبەستی كاری سەرجێیە– بەڵام هەر حەز دەكەم خێزانت بم و لە دوارۆژدا وەك هاوسەرێكی تۆ لەگەڵ خێزانەكانی ترت زیندوو بكرێمەوە، پاشتر دەستی لەو مافەی خۆی هەڵگرتووە كە پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خێزانەكاتی تری بە یەكسانی شەوەكانیان لە نێواندا دابەش بكات و ئەو مافەی خۆی بەخشیوەتە خاتوو عائیشە (رەزای خوای لێ بێت).

ـ لەبەر زۆریی تەمەن و لاواز بوونی بیریەوە خاتوو سەودە تەنیا پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

ـ لە مانگی شەووالی ساڵی پەنجا و چواری كۆچییدا و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعاویەی كوڕی ئەبوسوفیاندا (رەزای خوایان لێ بێت)، خاتوو سەودە كۆچی دوایی كردووە.

---

[٤] - مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص١٧٤- كتاب (١٨) الرضاع/ باب (١٤) جواز هبتها نوبتها لضرتها- الحديث (٣٧٠٢). إبن حبان (محمد بن حبان بن أحمد)-صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان- ج١٠/ص١٢- باب (١٢) القسم- مؤسسة الرسالة/ بيروت- ط١٩٩٣/٢- الحديث (٤٢١١)- تحقيق: شعيب الأرنؤوط- قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح على شرط البخاري.

## خێزانی سێیەم:

- پاش کۆچی دوایی خاتوو خەدیجە و هەر لە مەککەدا پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو عائیشەی مارە کردووە.

- خاتوو عائیشە لە شاری مەککە و لە ساڵی چواری پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ لەدایك بووە و لە تەمەنی حەوت ساڵیدا پێغەمبەری خودا ﷺ مارەی کردووە، پاش کۆچکردنی بۆ مەدینە، لە مەدینە و لە مانگی شەووالی ساڵی دووەمی کۆچی و لە تەمەنی نۆ ساڵیدا گواستویەتیەوە و ژیانی هاوسەری لەگەڵ دەست پێکردووە.

- خاتوو عائیشە ناوی: (عَائِشَةُ بِنْتُ أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ عبدِ الله بن أبي قُحافة، التَّيْمِيَّةُ) و کچی یەکەم هاوەڵ و جێنشین و باوەڕدار و خۆشەویسترین کەسی پێغەمبەر بووە ﷺ، دایکیشی ناوی: (أُمّ رُوومَانَ زينب بِنْتُ عَامِر)ە.

ـ پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر حەز و ویستی خۆی خاتوو عائیشەی هەڵنەبژاردووە، بەڵکو چەند جارێك لە خەودا پێی گوتراوە و وێنەی خاتوو عائیشەی پێ نیشان دراوە کە لە دواڕۆژدا دەبێتە خێزانی، لەو بارەیەشەوە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {أُرِيتُكِ فِي الْمَنَامِ مَرَّتَيْنِ أَرَى أَنَّكِ فِي سَرَقَةٍ مِنْ حَرِيرٍ يَقُولُ: هَذِهِ امْرَأَتُكَ، فَأَكْشِفُ فَإِذَا هِيَ أَنْت، فَأَقُولُ: إِنْ يَكُنْ هَذَا مِنْ عِنْدِ اللَّهِ يُمْضِهِ}[٥]. واتە: دوو جار لە خەودا تۆیان پیشان دام، لە دووتوێی پارچەیەك ئاوریشمدا بویت، ئەو فریشتەیەی کە نیشانی دەدام پێی دەگوتم: ئەوە خێزانتە، کە ئاوریشمەکەم دەکردەوە تۆم دەبینی، دەمگوت: ئەگەر ئەم کارە لە لایەن خوداوە بێت و ویستی ئەوی لەسەر بێت وا دەبێت.

---

٥ - البخاري- صحيح البخاري- ج٣/ص١٤١٥- كتاب (٦٦) فضائل الصحابة /باب (٧٣) تزويج النبي ﷺ عائشة، وقدومها المدينة، وبنائه بها- الحديث (٣٦٨٢). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٣٤- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١٣) في فضل عائشة رضي الله تعالى عنها- الحديث (٦٤٣٦).

- هەرچەندە خاتوو عائیشە هیچ منداڵیشی نەبووە بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ نازناوی (أُمَّ عَبْدِ اللّـهِ)ی لێ ناوە، بە خۆشی عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیرەوە کە خوشکەزای خاتوو عائیشە بووە و یەکەم منداڵی کۆچکەرەکان بووە کە لە مەدینە لەدایك بووە.

- خاتوو عائیشە لە نێوان خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ، خوای پەروەردگار میهری زۆری لەگەڵ کردووە و تایبەتمەندی زۆری هەبووە، خۆی لە بارەی هەندێکیانەوە دەفەرمووێت: (لَقَدْ أُعْطِيتُ تِسْعًا مَا أُعْطِيَتْهَا امْرَأَةٌ بَعْدَ مَرْيَمَ بِنْتِ عِمْرَانَ: لَقَدْ نَزَلَ جِبْرِيلُ بِصُورَتِي فِي رَاحَتِهِ حَتَّى أَمَرَ رَسُولَ اللهِ ﷺ أَنْ يَتَزَوَّجَنِي، وَلَقَدْ تَزَوَّجَنِي بِكْرًا، وَمَا تَزَوَّجَ بِكْرًا غَيْرِي، وَلَقَدْ قُبِضَ وَرَأْسُهُ فِي حِجْرِي، وَلَقَدْ قَبَرْتُهُ فِي بَيْتِي، وَلَقَدْ حَفَّتِ الْمَلَائِكَةُ بِبَيْتِي، وَإِنْ كَانَ الْوَحْيُ لَيَنْزِلُ عَلَيْهِ وَإِنِّي لَمَعَهُ فِي لِحَافِهِ، وَإِنِّي لَابْنَةُ خَلِيفَتِهِ وَصِدِّيقِهِ، وَلَقَدْ نَزَلَ عُذْرِي مِنَ السَّمَاءِ، وَلَقَدْ خُلِقْتُ طَيِّبَةً عِنْدَ طَيِّبٍ، وَلَقَدْ وُعِدْتُ مَغْفِرَةً وَرِزْقًا كَرِيمًا)[٦]. واتە: خوای پەروەردگار نۆ بەخششی لەگەڵم کردووە، کە لە پاش مەریەمی کچی عیمران لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی تردا نەیکردووە:

أ- جبریل هاتوەتە خوارەوە و لەسەر لەپی دەستی شێوەی منی پیشانی پێغەمبەری خودا ﷺ داوە و تەنانەت فەرمانی پێکردووە کە من بکاتە هاوسەر و خێزانی.

ب - پێغەمبەری خودا ﷺ منی بە کچی هێناوە و جگە لە من، هیچ کام لە خێزانەکانی تری کچ نەبوون.

---

٦ - أبو يعلى (أحمد بن علي بن المثنى الموصلي)- مسند أبي يعلى- ج٨/ص٩٠- دار المأمون للتراث/ دمشق- ط١/١٤٠٤- تحقيق: حسين سليم أسد- الحديث (٤٦٢٦). الهيثمي (علي بن أبي بكر الهيثمي)- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد- ج٩/ص١٩٠- دار الفكر/ بيروت- ط/١٤١٢- الحديث (١٥٣٠٧). المباركفوري (محمد عبد الرحمن عبد الرحيم)- تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي- ج١٠/ص٢٥٦- باب (٢٤) فضل عائشة رضي الله عنها- دار الكتب العلمية/ بيروت.

پ ـ پێغەمبەری خودا ﷺ سەری لە سەر سنگ و لە باوەشی من بوو کاتێك وەفاتی کرد.

ت ـ تەرمی پیرۆزی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ماڵەکەو لە ژورەکەی مندا بە خاك سپێردراوە.

ج ـ فریشتەکانی خودا دەورەی ژورەکەی منیان داوە.

ح ـ هەندێکجار کە نیگای بۆ دەهات لەگەڵ من لە ژێر یەك پێخەفدا بووین.

خ ـ من کچی یەکەم جێنشین و هاوەڵ و باوەڕپێکراوی پێغەمبەری خودام ﷺ.

د ـ خودای پەروەردگار شایەتی داوێنپاکیی بۆ داوم، گەواهی و بەڵگەی داوێنپاکی من لە ئاسمانەوە و لە قورئاندا هاتۆتە خوارەوە.

ز ـ بە پاکیی و باشی لە خێزان و بنەماڵەیەکی باش و پاکدا دروست و پەروەردە بووم.

ژ ـ خوای گەورە بەڵێنی لێخۆش بوون و رۆزییەکی پڕ لە میهری پێ داوم.

ـ سەرەڕای ئەمانە هەمووی کە خاتوو عائیشە خۆی باسیان دەکات:

أ ـ پێغەمبەری خودا ﷺ لە هەموو کەس زیاتر خۆشی ویستوە، عەمری کوڕی عاص بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت، لە پێغەمبەری خودام ﷺ پرسی: (أيُّ النَّاسِ أحَبُّ إِلَيْكَ قَالَ: {عَائِشَةُ} قُلْتُ: مِنَ الرِّجَالِ. قَالَ: {أبوهَا}..)[7]. واتە: کێت لە هەموو کەس زیاتر خۆش دەوێت؟ فەرموی: {عائیشە} وتم: ئەی لە پیاوان؟ فەرموی: {باوکی}.

ب ـ جبریل بە پێغەمبەری خودا ﷺدا و بە تایبەتی سڵاوی بۆ ناردووە، خاتوو عائیشە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: رۆژێکیان پێغەمبەری خودا پێی گوتم: {یا

---

٧ - البخاري- صحيح البخاري- ج٣/ص١٣٣٩- كتاب (٦٦) فضائل الصحابة/ باب (٥) قول النبي ﷺ (لو كنت متخذا خليلا)- الحديث (٣٤٦٢). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٠٩- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١) من فضائل أبي بكر الصديق رضي الله عنه- الحديث (٦٣٢٨).

عَائِشَةَ هَذَا جِبْرِيلُ يُقْرِئُكِ السَّلَامُ}[8]. واتە: {ئەی عائیشە ئەوە جبریلە سڵاوت لێ دەکات}.

ت ـ یەکێك بووە لە شارەزا ناودارەکانی ناو خێزانەکان و هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ، هەر کات هاوەڵان کێشەیەکیان لێ ئاڵۆز ببوایە دەگەڕانەوە لای خاتوو عائیشە تا بۆیان روون بکاتەوە، لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خودا دا ﷺ، نزیکەی دوو هەزار و دووسەد و دە فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ لەبەر کردووە و گێڕاوەتەوە.

(إِبْنُ كَثِيرٍ) دەربارەی خاتوو عائیشە دەفەرموێت: (لَمْ يكنْ في الأُمَمِ مثلُ عائشةَ في حِفْظِها، وعِلْمِها، وفَصاحَتِها، وعَقْلِها)[9]. واتە: "لە ناو هیچ نەتەوەیەکدا ئافرەتی وەکو خاتوو عائیشە لە بیرتیژیی، زانایی، رەوانبێژی و ژیریدا هەڵنەکەوتووە".

ئیمامی (ذهَبي) یش لە بارەیەوە دەفەرموێت: (أفْقَهُ نساءِ الأُمَّةِ علَى الإطلاقِ، ولا أعْلَمُ في أُمَّةِ محمد ﷺ بَلْ ولا في النساءِ مطلقاً امرأةً أعْلَمَ منْها)[10]. واتە: "شارەزاترین ئافرەتی ئەم نەتەوە و ئوممەتەیە بەرەهایی، نە لە نەتەوەی موحەممەد ﷺ و نە لە ناو ئافرەتاندا بە گشتیی ئافرەتێکی لەو زیرەکتر نازانم".

---

٨ - البخاري- صحيح البخاري- ج٣/ص١٣٧٤- كتاب (٦٦) فضائل الصحابة/ باب (٣٠) فضل عائشة رضي الله عنها- الحديث (٣٥٥٧). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٠٩- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١) من فضائل أبي بكر الصديق رضي الله عنه- الحديث (٦٣٢٨). النسائي (أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن)- سنن النسائي الكبرى- ج٥/ص١٠٢- دار الكتب العلمية/ بيروت- ط١/١٤١١- تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري, سيد كسروي حسن- الحديث (٨٣٨٣).

٩ - إبن كثير (إسماعيل بن عمر بن كثير)- البداية والنهاية- ج٣/ص١٢٩- مكتبة المعارف/ بيروت.

١٠ - الذهبي (شمس الدين أبو عبد الله محمد بن أحمد)- سير أعلام النبلاء-ج٣/ص١١٩- مؤسسة الرسالة/ بيروت- تحقيق: مجموعة محققين بإشراف شعيب الأرناؤوط.

تەنانەت هەندێك لە زانایان دەفەرموون: "کە یەك لەسەر چواری هەموو حوکمە شەرعییەکان لە خاتوو عائیشەوە گێڕدراوەتەوە و ئەو سەرچاوەیەتی"[11].

ـ خاتوو عائیشە یەکێك بووە لەو ئافرەتە ناودارانەی کە بە شەرم و شکۆ، خواناسی، بەخشندەیی و میهرەبانی ناوبانگی دەرکردبوو، تەنانەت لە مردوویش شەرمی دەکرد، لەو بارەیەوە دەفەرموێت: (كُنْتُ أَدْخُلُ بَيْتِي الَّذِي دُفِنَ فِيهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَأَبِي فَأَضَعُ ثَوْبِي فَأَقُولُ إِنَّمَا هُوَ زَوْجِي وَأَبِي، فَلَمَّا دُفِنَ عُمَرُ مَعَهُمْ فَوَاللَّهِ مَا دَخَلْتُ إِلاَّ وَأَنَا مَشْدُودَةٌ عَلَيَّ ثِيَابِي حَيَاءً مِنْ عُمَرَ)[12]. واتە: "کاتێك دەچوومە ئەو ژوورەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ و باوکمی تێدا بەخاك سپێردرابوو، جلەکانم دادەنا و دەمگوت: ئەوەیان هاوسەرمە و ئەوەیشیان باوکمە، بەڵام کاتێك ئیمامی عومەریان لەوێ لەگەڵ ئەوان بەخاك سپارد، سوێند بەخوا هیچ جارێك نەچوومەتە ئەوێ ئیللا سەرپۆش و جلەکانم توند لە خۆم دەئاڵاند لە شەرمی ئیمامی عومەردا".

سەبارەت بە بەخشندەیی و میهرەبانیی خاتوو عائیشە (أُمّ دُرَّة) دەگێڕێتەوە کە جارێکیان نزیکەی سەد هەزار درهەمیان بۆ نارد، ئەویش بەڕۆژوو بوو، دانیشت و دەستی کرد بە دابەشکردنی هەتا ئێوارە هیچی لێ نەمایەوە، پاشان کە ویستی ڕۆژووەکەی بشکێنێت، تەنیا نان و ڕۆنیان هەبوو ڕۆژووی پێ بشکێنێت، (أُمّ دُرَّة) دەڵێت: پێم گوت: نەتدەتوانی لەو هەموو پارەیە بایی یەك درهەم گۆشتت بکڕیایە ئێستا ڕۆژووەکەت پێ بشکاندایە؟ فەرمووی: لێم توڕە مەبە ئەگەر زووتر قسەت بکردایە بەقسەم دەکردیت.

---

١١ - المباركفوري (محمد عبد الرحمن بن عبد الرحيم)- تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي- ج١٠/ص٢٥٥- دار الكتب العلمية/ بيروت.

١٢ - الإمام أحمد (أحمد بن حنبل)- المسند- ج٤٢/ص٤٤٠- مؤسسة الرسالة/ بيروت- ط٢/١٤٢٠- الأثر (٢٥٦٦٠).

ـ له ساڵی پەنجا و هەشتی کۆچیدا و هەر لە مەدینە لە شەوی سێشەممە ڕێکەوتی حەڤدەی مانگی ڕەمەزان لە تەمەنی شەست و شەشساڵیی کۆچی دوایی کردووە و وەسیەتی کردووە کە ئەبوهورەیرەی هاوەڵی پێغەمبەر نوێژی لەسەر بکات، گیانی پاکی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاک سپێردراوە.

لەبەر ئەوەی هاوسەرگیریی خاتوو عائیشە قسە و باسی زۆری لەسەر دەکرێت، خەڵکانی ناحەز بە شێوەیەکی دوور لە ڕاستیی نیشان و نمایشی دەکەن، بۆ وەڵامدانەوەی ئەو جۆرە کەسانە و خستنە ڕووی ڕاستییەکان وەکو خۆی، بەپشتیوانی خودای پەروەردگار لە چەند تێبینی و سەرنجێکدا قسە لە سەر هەموو لایەن و چەمکەکانی ئەو هاوسەرگیرییە دەکەین.

## تێبینییەکان:

**یەکەم**: سەبارەت بە جیاوازیی تەمەن لە نێوان خاتوو عائیشە و پێغەمبەردا ﷺ، کە خەڵکانێك پێیان وایە ئەو هاوسەرگیرییە لەم ڕووەوە گونجاو نەبووە، بۆ ڕوونکردنەوە و هەڵسەنگاندنی ئەو ڕەخنەیە چەند خاڵێك دەخەینە ڕوو:

١ـ هەڵسەنگاندنی ئەو جیاوازییە لە نێوان تەمەنیاندا کە ئایا تا چەند گونجاو بووە، یان نا، چەند پێوەرێك هەیە کە ئێمە لە ڕێگەیانەوە دەتوانین ئەو حوکمە بدەین، ئەو پێوەرانەیش بریتین لە: پێوەری شەرعی، یاسایی، زانستی و پزیشکی، دابونەریتی کۆمەڵایەتی.

### أـ سەبارەت بە پێوەری شەرعی لە دوو ڕووەوە قسەی لەسەر دەکەین:

ڕووی یەکەم: بەشێوەیەکی گشتیی ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە و لەوە دڵنیاین کە پێغەمبەری خودا ﷺ هەر کارێکی کردبێت لە دوو دەرهاویشتەوە بووە:

یەکەمیان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار نیگای بۆ ناردووە و فەرمانی پێ کردووە کە ئەو کارە بکات.

دووەمیان ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ بە بۆچوونی خۆی پێی باش بووە بیکات و کردوویەتی، جا ئەگەر بۆچوونەکەی دروست بووبێت و راستی پێکابێت ئەوە وەك خۆی رۆیشتووە و باوەڕداران کاریان پێ کردووە و وەك سوننەت تەماشایان کردووە.

بەڵام ئەگەر لە بۆچوونەکەیدا نەیپێکابێت ئەوە خوای پەروەردگار لێی بێدەنگ نەبووە و لە رێی نیگاوە بۆچوونەکەی راست کردووەتەوە و رێگەی راستی پیشان داوە.

کەواتە: لە ئەنجامدا و لە هەردوو حاڵەتەکەدا هەرچی پێغەمبەری خودا ﷺ کردبێتی و لەسەری بەردەوام بووبێت، ئەوە ویستی خوای لەسەر بووە و خوا پێی رازی بووە، هەر لەم رووەیشەوەیە کە خوای پەروەردگار سەبارەت بە هەموو هەڵسوکەوتێکی پێغەمبەر ﷺ بە رەهایی دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنْطِقُ عَنِ الْهَوَى إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَى﴾[13]. واتە: "پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ شتێك لە خۆیەوە ناڵێت، ئەوەی دەیڵێت هەمووی نیگایە و لە ئێمەوەیە".

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا آتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَاكُمْ عَنْهُ فَانْتَهُوا﴾[14]. واتە: "هەرچی پێغەمبەر ﷺ دەیڵێت و دەیکات و فەرمانی پێدەکات لە رووی شەرعەوە، وەکو ئایین و سوننەت، ئەوە وەری بگرن و بەگوێی بکەن، هەرچیش ئەو رێگیریی لێ دەکات لەم رووەوە ئەوە مەیکەن و وازی لێ بهێنن".

هەر بۆیە و بەم پێوەرە گشتییە دڵنیاین کە ئەگەر هاوسەرگیریی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشە بچووکترین قسە، یان رەخنەی هەڵبگرتایە، ئەوە خوای پەروەردگار لێی بێدەنگ نەدەبوو، رێگەی پێ نەدەدا.

---

[13] - سورة النجم: الآية: ٣-٤.

[14] - سورة الحشر: الآية : ٧.

بەشێوەیەکی تایبەتیش لە چەندین دەقدا لە کتێبە دروستەکانی فەرموودەدا هاتووە کە هاوسەرگیریی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشە بە ویست و خواستی خۆی نەبووە، بەڵکو بە فەرمانی خودا بووە و لە ڕێگەی نیگاوە بووە، جبریل بۆ چەند جارێك شێوەی خاتوو عائیشەی پیشان داوە و پێی ڕاگەیاندووە کە ئەو ئافرەتە دەبێتە خێزانی و دەبێت بیهێنێت، پێشتر دەقێکمان لەو بارەیەوە باس کرد.

کەواتە لە ڕووی شەرعییەوە ئەم کارەی پێغەمبەر ﷺ هیچ قسە هەڵناگرێت، هەرکەس ڕەخنە لەم کارە بگرێت، یان بە نەگونجاوی لە قەڵەم بدات، ئەوە بییەوێت یان نەیەوێت ڕەخنە لە فەرمان و کاری خودای کاربەجێ دەگرێت، ئەمەیش بە دڵنیاییەوە زیان بە باوەڕی مرۆڤی باوەڕدار دەگەیەنێت.

**ڕووی دووەم:** لای هەموان ئاشکرایە کە ئەرکی ڕوونکردنەوەی فەرمانەکانی خوای پەروەردگار و ئایەتەکانی قورئان و حوکمە شەرعییەکان بە پێغەمبەری خودا ﷺ سپێردراوە، خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴾[١٤]. واتە: ئێمە ﴿ذِّكْرَ﴾مان بۆ تۆ ناردووەتە خوارەوە، بۆ ئەوەی ئەوەیان بۆ ڕوون بکەیتەوە کە بۆیان هاتووەتە خوارەوە، مەبەست لە ﴿ذِّكْرَ﴾ لەم ئایەتەدا سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ و فەرموودەکانێتی، ﴿مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾ مەبەست پێی قورئانە.

کەواتە بە بەڵگەی ئەم ئایەتەیش دیسانەوە سوننەتەکانی پێغەمبەریش ﷺ هەر نیگایە و لە خوداوەیە، زۆربەی سوننەتەکانی پێغەمبەریش ﷺ دەکەونە خانەی ئەرکی ڕوونکردنەوەی حوکمە شەرعییەکانەوە، بۆیە دەبینین زۆرکات بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی حوکمێکی شەرعی، پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی هەستاوە

---

[١٤] - سورة النحل: الآية: ٤٤.

کارەکەی کردووە، بۆ ئەوەی بۆ خەڵکیی روون بکاتەوە کە سنووری ئەو کارە چەندە و چۆن ئەنجام دەدرێت.

سەبارەت بە هاوسەرگیریی پێغەمبەریش ﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشە، هەر هەمان مەبەستی تێدا بەدی دەکرێت، کە پێغەمبەری خودا ﷺ ویستویەتی سەرەتای تەمەنی گونجاو بۆ هاوسەرگیریی بۆ باوەڕداران دیاریی بکات، کە تەمەنی حەوتساڵییە، بۆ ئەوەی کە موسڵمانان ئەوە بزانن کە لە سەرەتای تەمەنی حەوت ساڵییەوە ئافرەت و پیاو دەکرێت لەسەر رەزامەندیی خۆیان و لەبەر بەرژەوەندیی خۆیان بە پرسی باوکیان، یان ئەو کەسەی کە سەرپەرشتییان دەکات گرێبەستی هاوسەر گیریی ئەنجام بدەن، بە باڵغبونیان ژیانی خێزانی دەست پێ بکەن، دیارە لە وڵاتە گەرمەکاندا مرۆڤ لە تەمەنی نۆ ساڵیدا باڵغ دەبێت.

هەر بۆیە پێویستە لە دیدی خەڵکی باوەڕداردا ئەم کارەیش وەك ئەرکێکی تری پێغەمبەرایەتی سەیر بکرێت، نەك وەك خواست و حەز و ئارەزوویەکی تاکەکەسی پێغەمبەر ﷺ.

**ب ـ سەبارەت بە پێوەری یاسایی:**

ئەگەر لە رووی یاساییشەوە بمانەوێت قسە لەسەر ئەم هاوسەرگیرییە و تەمەنی خاتوو عائیشە بکەین:

ئەوە خاتوو عائیشە کاتێك مارە بڕدراوە لە تەمەنی حەوت ساڵییدا بووە، لە رووی یاساییەوە مرۆڤ لەم تەمەنەدا (أهلية الأداء الناقصة)ی هەیە[16]، واتە: مرۆڤ توانست و شیاوی یاسایی هەیە کە هەندێك لەو کار و ئەرکە یاساییانەی دەکەوێتە ئەستۆی بەئەنجامی بگەیەنێت.

---

[16] - هەرچەندە یاسای باری کەسێتی ئێستا لە تەمەنی پازدە ساڵییدا بەو چاوە سەیری مرۆڤ دەکات، بەڵام ئەمە لە رووی زانستی و شەرعیشەوە هەڵەیە، چونکە مرۆڤ لە تەمەنی پازدە ساڵییدا باڵغە و هەموو ئەرك و حوکمە شەرعییەکان دەیگرێتەوە، هەرگیز ناکرێت بە چاوی منداڵ سەیر بکرێت.

بەشێوەیەکی گشتیی ئەو ئەرك و کارانەی مرۆڤ لەم تەمەنەدا ئەنجامی دەدات دەکرێت بە سێ بەشەوە:

**یەکەم:** ئەگەر ئەو کارەی دەیکات جگە لە زیان، چاوەڕوانی سوودی لێ نەدەکرا، ئەوە ئەو کارەی لە ڕووی یاساییەوە بەتاڵە و هیچ شوێنەواری لێ ناکەوێتەوە، کەسیش مافی ئەوەی نییە مۆڵەتی بدات.

**دووەم:** ئەگەر ئەو کارەی دەیکات جگە لە سوود، چاوەڕوانی زیانی لێ نەدەکرا، ئەوە ئەو کارەی لە ڕووی یاساییەوە یەکسەر جێبەجێ دەکرێت و دروستە و هیچ گرفتی نییە، هەموو شوێنەوارێکی یاساییشی لەسەر دروست دەبێت و پێویستی بە مۆڵەتی کەس نییە.

**سێیەم:** بەڵام ئەگەر کارەکەی ئەگەری سوود و زیانیشی هەبوو، ئەوە پرس بە باوك، یان کەسی سەرپەرشتیاری دەکرێت، ئەگەر مۆڵەتی کردنی کارەکەی دا، ئەوە وەك بەشی دووەم وایە و دروستە و هیچ گرفتی نییە، بەڵام ئەگەر ڕێگەی پێ نەدا، ئەوە وەکو بەشی یەکەم وایە و بەتاڵە و هیچ شوێنەواری لێ ناکەوێتەوە.

گرێبەستی هاوسەرگیریی لە بەشی سێیەم پۆلێن دەکرێت کە ئەگەری سوود و زیانیشی هەیە و بە پرسی کەسی سەرپەرشتیار جێبەجێ دەکرێت.

جا خاتوو عائیشە لە تەمەنی حەوت ساڵییدا و بە پرسی باوکی ئەم گرێبەستەی بۆ ئەنجام دراوە، کەواتە لە ڕووی یاساییشەوە هیچ گرفتی نییە و بە هاوسەرگیرییەکی دروست و تەواو دادەنرێت، ئەگەرچی بە فەرمییش لە دادگا تۆمار نەکرێت.

ئەمە جگە لەوەی کە لە ڕووەکانی تریشەوە ئەم گرێبەستەی نێوان پێغەمبەری خودا ﷺ و خاتوو عائیشە هەموو بنەما و مەرجەکانی دروستیی هاوسەرگیریی تێدا بووە، لە کاتی گواستنەوەیشیدا خاتوو عائیشە باڵغ بووە و بەو هاوسەرگیرییەی ڕازی بووە، ئافرەتی باڵغیش بۆی هەیە هاوسەرگیریی ئەنجام بدات

بە ڕەزامەندی باوکی، یان کەسی سەرپەرشتیاری، بەبێ ئەوەی کەسی تر بۆی هەبێت دەست بخاتە کارەکانییەوە، یان ڕەخنەی لێ بگرێت.

**ت ـ سەبارەت بە پێوەری زانستی:**

لە رووی زانستیشەوە شتێکی بەڵگە نەویستە کە ئافرەتان لە ناوچە گەرمەکاندا زووتر پێدەگەن، بە بەراورد بە ئافرەتان لە ناوچە ساردەکاندا، بۆ نموونە ئافرەتانی زۆرێك لە ولاتانی کەنداو لە تەمەنی هەشت ـ نۆ ساڵییدا پێدەگەن، بەلام لە ناوچە ساردەکاندا لە تەمەنی سیازدە ـ چواردە ساڵییدا پێدەگەن.

خاتوو عائیشەیش لە ناوچە گەرمەکاندا ژیاوە، هەر بۆیە زانایان کۆکن لە سەر ئەوەی کە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ گواستویەتیەوە تەمەنی نۆ ساڵان بووە و لە هەمان کاتیشدا باڵغیش بووە.

ئایا هاوسەرگیریی لەم تەمەنەدا تا چەند ئەگەری زیان، یان سوودی لێ دەکرێت لە رووی زانستییەوە؟

دیارە ناکرێت ئێمە بڵێین: هیچ ئەگەری زیانی نییە، چونکە ئەمە دوورە لە راستییەوە، بەلام ئەگەر بشڵێین: هیچ سوودی نییە، وەك هەندێك لە رێکخراوەکان بانگەشەی بۆ دەکەن، ئەمەش دیسانەوە دوورە لە راستییەوە.

چونکە ئەم کارەیش وەکو سەرجەم کارەکانی تری مرۆڤ، ئەگەری سوود و زیانیشی هەیە، بەلام من لێرەدا لە بەر کەمی ماوە تەنیا باسی سوودەکانی دەکەم، چونکە زۆر باسی زیانەکانی بۆ خەڵك کراوە و بگرە زیادەڕۆیشی تێدا کراوە و زۆریشی بۆ هەڵبەستراوە.

لەم بارەیەوە زانایان دەڵێن: گرنگترین سوودەکانی هاوسەرگیریی ئافرەتان لە سەرەتای تەمەنی پێگەیشتنندا ئەوەیە کە بەشێوەیەکی بەرچاو رێژە و ئەگەری توشبوون بە شێرپەنجەی مەمك و رەحم و هێلکەدان کەم دەکاتەوە، کە بەداخەوە

ئەمڕۆ بە شێوەیەکی بەرچاو لـە ئافرەتانـدا بـەدی دەکرێـت، ئەگـەری منـداڵبوون و پیتاندن لەو تەمەنەدا زۆر زیاترە، ئەگەری لـە بارچـوونی منـداڵیش (إجهـاض) لـەم تەمەنەدا زۆر دەگمەن دەبێت، بە بەراورد بە تەمەنەکانی تر.

هەروەها هاوسەرگیریی لە سەرەتاکانی تەمەنی پێگەیشتندا زۆر سـوودی تـری هەیە لە زۆر رووی تـرەوە لەوانـە: ئەگـەری لادانـی لاوان بەڕێژەیـەکی بەرچـاو کـەم دەکاتەوە، گیانی هەست کردن بە بەرپرسیاریتیان تێدا دروسـت دەکـات، دیـاردەی قەیرە بوون و مانەوی لاوان لە دەرەوەی بازنەی هاوسـەرگیریی بنـەبڕ دەکـات، کـە ئـەمڕۆ لـە کوردسـتاندا خەریکـە ببێتـە دیـاردە و لایەنـە پەیوەندیـدارەکان گـوێی خۆیانیان لێ دەخەوێنن و باسی زیانەکانی ناکەن.

هەر بۆیـە سـوودەکانی ئـەم جـۆرە هاوسـەرگیرییە زۆر زیـاترن لـە زیانـەکانی، ڕێگەپێدانی شەرع و کاری پێغەمبەریش ﷺ دوو بەڵگەی زەقی ئەم راستییەن.

**پ ـ سەبارەت بە پێوەری دابونەریتی کۆمەڵایەتییش:**

سـەرەتا ئێمـە کاتێـك دەمانـەوێت حـوکم بەسـەر هـەر کارێکدا بـدەین کـە لـە رابردوویەکی دووردا روویداوە لـە رووی شـیاویی، یـان نەشـیاویی کۆمەڵایەتییـەوە، دەبێت بارودۆخ و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکان و سەردەمی روودانی کارەکە بخرێتە بەر چـاو و بەهەنـد وەربگیرێـت لـە کـاتی حوکمدانـدا، گـەر نـا ئـەوە حوکمەکـەمان لاسەنگ و ستەمکارانە دەبێت.

هاوسـەرگیریی پێغەمبـەریش ﷺ لەگـەڵ خـاتوو عائیـشە بـەر لـە هـەزار و چوارسەد و سی و سێ سـاڵ روویـداوە، بۆیـە ئێمـە نـاتوانین لـە روانگـەی سـەدەی بیست و یەك و دابونەریتە کۆمەڵایەتییەکانی ئەم سەردەمەوە حوکمی شیاویی، یان نەشیاویی ئەو هاوسەرگیرییە بدەین، بەڵکو دەبێت بگەڕێینەوە بـۆ ئـەو سـەردەم و بارودۆخەی کە هاوسەرگیرییەکە تێیدا رووی داوە.

چونکە لەو سەردەمانەدا لە نـاو کۆمـەڵگای عـەرەبی بـە گـشتیی و قـوڕەیش و مەککە بە تایبەتی تەمەن لـە پرۆسـەی هاوسـەرگیرییدا زۆر بەهەنـد وەرنـەگیراوە و

قسەی لەسەر نەکراوە، هەر بۆیە دەبینین پێغەمبەری خودا ﷺ بەر لە خاتوو عائیشە، دوو خێزانی تری هەبووە هەردووکیان پازدە ساڵ تەمەنیان لە خۆی زیاتر بووە و هەردووکیان بێوەژن بوون، شتێکی ئاسایی بووە و قسەیشی لەسەر نەکراوە.

پاشتریش کە خاتوو عائیشەی لەو تەمەنەدا هێناوە دیسانەوە شتێکی ئاسایی بووە و کەس قسەی لەسەر نەکردووە و نەبووەتە جێی رەخنەی بێباوەڕان، لە کاتێکدا ئەوان بە شوێن بچوکترین رەخنەدا دەگەڕان کە لەسەر پێغەمبەری خودای ﷺ بگرن.

ئەمە جگە لەوەی کە هاوشێوەی ئەو هاوسەرگیرییە زۆر باو بووە، بەڵام لەبەر بێبایەخییدا باس نەکراون، خۆ ئەگەر پێغەمبەریش ﷺ وەکو کەسێکی ئاسایی بوایە و مێژووی تەمەنی بە هەموو وردەکارییەکانییەوە تۆمار نەکرایە، ئەوا ئەم هاوسەرگیرییەیش وەك سەدان و هەزارەها هاوسەرگیریی هاوشێوەی خۆی هەر باس نەدەکران و مێژوو تێی دەپەڕاند.

هەر بۆ نموونە: (عَبْد الْمُطَّلِب)ی باپیری پێغەمبەر ﷺ کاتی خۆی (هَالَة)ی ئامۆزا و هاوتەمەنی (آمِنَة)ی دایکی پێغەمبەری ﷺ هێناوە، کە (آمِنَة) خێزانی بچووکترین کوڕی بووە کە (عَبْدُ اللّه)ی باوکی پێغەمبەرە ﷺ.

هەروەها ئیمامی عومەر کچێکی ئیمامی عەلی هێناوە کە عومەر لە باوکیشی گەورەتر بووە (رەزاو رەحمەتی خوایان لێبێت).

جا ئەم دابونەریتە کە کاتی خۆی باو بووە تا چەند لەگەڵ دابونەریتی ئەم سەردەمەدا دەگونجێت ئەمە مەسەلەیەکی ترە.

ئەم جیاوازییەی نێوان دابونەریتەکان و سەردەمەکان خۆی لە خۆیدا هەرگیز نابێتە پێوەری ئەوەی کە ئێمە لەوان باشترین، یان دابونەریتی ئێمە بە بەهاتر و باڵاترە، بەڵکو پێوەری شەرع ئەم حوکمە یەکلا دەکاتەوە و دەیسەلمێنێت کە کام کۆمەڵگا و دابونەریتی کام سەردەم بە بەهاتر و باڵاترە.

تەنانەت لە رووی حوکمیشەوە ئەو دابونەریتە دەکرێتە بەڵگە و سەرچاوەی حوکمی شەرعی کە لەگەڵ بەڵگە و بنەما شەرعییەکاندا تەبا و گونجاو بێت، گەر نا ئەوە هیچ نرخی نییە و پێویستە بنەبڕ بکرێت، هەرچەند و هەرچۆن و لە هەر کات و سەردەمێکدا بێت.

هەر بۆیە ناتوانین بڵێین بە خاتری ئەوەی ئەو دابونەریتەی کاتی خۆی لە ناو مەککە و قورەیشدا باو بووە، هەر لەبەر ئەوەی لەگەڵ دابونەریتی ئەم سەردەمەدا ناگونجێت، بۆیە پێویستە بنەبڕ بکرێت و بە هەڵە و نەشیاو باس بکرێت.

چونکە زۆر بەداخەوە لەگەڵ ئەو هەموو پێشکەوتنە زانستی و تەکنەلۆژییەدا هەندێك ئاکار و نەریتی هەندێك لە کۆمەڵگاکانی سەدەی بیست و یەك هەیە، کە نەك تەنیا کۆمەڵگاکانی پێشتر نەیان کردووە و بیریان لێ نەکردووەتەوە، بەڵکو تەنانەت لە ناو هیچ جۆرێك لە ئاژەڵانیشدا شتی وا بێزراو و قێزەون نییە و دەگمەنە.

کەواتە بە هەموو ئەو پێوەرانەی باسمان کردن کە بنەمان بۆ هەر حوکمێکی شەرعی، ئەم هاوسەرگیرییەی پێغەمبەری خودا ﷺ دروست بووە و رەخنە هەڵناگرێت.

سەبارەت بەو لایەنەیش کە گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی ئارەزووباز بووە و هەر لەو رووەیشەوە و بۆ ئەو مەبەستەش خاتوو عائیشەی هەڵبژاردووە و هێناوە. بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی ئەم لایەنە و دەرخستنی رووی راستییەکان لەم بارەیەشەوە چەند خاڵێك دەخەینە روو:

١- سەرەتا لە رووی زانستییەوە وەکو زانایان و پزیشکان دەڵێن: مرۆڤ هێز و تواناکان و گەشەی جەستەیی هەتا تەمەنی سی و سێ ساڵ بەردەوام دەبێت، پاشان گەشەی لاشە و تواناکان لە تەمەنی سی و سێ ساڵی تا تەمەنی چل ساڵی رادەوەستێت، پاشتر لە تەمەنی چل ساڵییەوە هێز و تواناکان روو لە کزی و دارووخان دەکەن.

پێغەمبەری خوداش ﷺ لە تەمەنی پەنجا و چوار ساڵی ژیانی هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو عائیشە دەست پێکردووە، واتە پاش چواردە ساڵ لە داروخانی تەمەن و کزبوونی توانا جەستەیی و غەریزییەکانی.

جا ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی ئارەزووباز بوایە، ئەوە دەبوو لە هەرەتی لاوی و تەمەنی گەنجیدا ئەم جۆرە هاوسەرگیرییەی بکردایە، نەك لەو تەمەنەدا.

٢ـ پێغەمبەری خودا ﷺ لە تەمەنی لاوی لە مەککەدا و لەناو قورەیشدا بووە و ژیاوە، هەمووشمان دەزانین کە کۆمەڵگای قورەیش و شاری مەککە پڕ بوو لە دیاردەی خراپ، ئافرەتی سۆزانی، ماڵی لەش فرۆشی، ئافرەتانی کۆیلە و دیاردەی فرەژنی بێ سنوور، هیچ کام لەم کارانە یان دیاردە دزێوانە لەو کۆمەڵگا و سەردەمانەدا بۆ پیاوان بە عەیبە و خراپەیش سەیر نەدەکران، بەڵکو بە پێچەوانەوە پیاوان خۆیان پێوە بادەدا و بە شانازییەوە باسیان دەکرد.

بەڵام قەت نەبیستراوە و باس نەکراوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەو تەمەنەیشدا، لەو کاتەیش کە هیچ خێزانی نەبووە و پابەندیش نەبووە بە هیچ ئایینێکەوە، تەنیا قسەیەکی ناشیرینی لەدەم هاتبێت، چجای ئەوەی کاری خراپ و بەدی کردبێت، یان بە شوێن ئارەزووبازی و ئەو جۆرە شتانەدا گەڕابێت.

خۆ ئەگەر خوا نەکردە جارێك لە جاران خوویەکی خراپ، یان کارێکی نابەجێی بکردایە، ئەوە بەدڵنیاییەوە دوژمنانی لێی بێ دەنگ نەدەبوون و باسیان دەکرد و دەیاندایەوە بە چاویدا، مێژوویش تۆماری دەکرد.

بەڵام ئەم بە پێچەوانەوە لەو کۆمەڵگا بەد و خراپەیشدا، هەر لە سەرەتای لاوێتیشەوە نازناوی بە داوێنپاك و دەستپاك دەرکردبوو، نموونە و پێشەوای هەموو ئاکارێکی باش بوو.

جا ئەگەر کەسێکی سادە لە سەرەتای لاوێتییەوە گوێی بەو شتانە نەدابێت، کە زۆر بەئاسانییش دەستی کەوتبێت و بۆی لوابێت، ئایا لە تەمەنی پیری و

سەردەمی پێغەمبەرایەتی و سەرقاڵبوون بە باری قورسی بانگەوازەوە خوو دەداتە ئەو شتانە و خولیایان دەبێت؟

بەڕاستی ئەمە قسە و بۆچونێکە مەگەر تەنیا لە ناحەزانی ئەو زاتە و لە بیری پیر و پووچی ئەوان وەشابێتەوە.

٣ـ پێغەمبەری خودا ﷺ هەتا تەمەنی بیست و پێنج ساڵی ژنی نەهێناوە، یەکەم ژنیش کە هێناویەتی بێوەژنێك بووە تەمەنی چل ساڵ بووە و پازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە و لەسەر داوای خۆی مارەی کردووە، بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵ ژیانی لەگەڵ بەسەر بردووە و هیچ ژنی تریشی بەسەر نەهێناوە تا کۆچی دوایی کردووە.

پاش ئەویش و لە تەمەنی پەنجا و یەك ساڵیدا پێغەمبەری خودا ﷺ ژنی دووەمی هێناوە کە خاتوو سەودە بووە و تەمەنی شەست و شەش ساڵ بووە و شەش منداڵیشی هەبووە، ژنی دووەمیشی بەهەمان شێوەی ژنی یەکەم پازدە ساڵ تەمەنی لە خۆی زیاتر بووە و نزیکەی چوار ساڵ لەگەڵی بووە و ژنی تری بەسەر نەهێناوە.

ئایا دەگونجێت کەسێکی ئارەزووباز لەو تەمەنی لاوییەیدا بەو جۆرە ئافرەتانە رازی بێت؟ ئەو هەموو تەمەنی لاوییەیان لەگەڵ بگوزەرێنێت بەبێ ئەوەی بچوکترین خیانەتیان لێ بکات، یان ژنیان بەسەر بێنێت، وەك لەگەڵ خاتوو خەدیجە بیست و پێنج ساڵ ژیاوە و هیچ ژنی بەسەر نەهێناوە.

٤ـ وەك پێشتر باسمان کرد خاتوو عائیشە لە تەمەنی نۆ ساڵیدا ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەست پێ کردووە، واتە سەرەتای تەمەنی پێگەیشتنی بووە، ئافرەتیش لەم جۆرە تەمەندا لە رووی ئارەزووبازییەوە هەرگیز جێی سەرنجی پیاو نییە و پیاو تامەزرۆی نابێت، چونکە زۆربەی ئەندامە جنسیە هەستیارەکانی تەواو کامڵ نەبوون و پێ نەگەیشتوون.

هەروەها ئافرەتەکە خۆیشی لە لایەنی خۆیەوە لەو تەمەنەدا وەڵامدانەوەی بۆ بزوێنەر و ورێژێنەرە جنسیەکان ئەو وەڵامدانەوەیە نییە، کە پیاوێکی ئارەزووباز چاوەڕوانی دەکات، کەواتە ئەگەر پیاوەکەیش لە لایەنی خۆیەوە زۆر ئارەزووباز بێت ئەوە بەدڵنیاییەوە ئافرەتەکە لەم تەمەنەدا ناتوانێت ئەو کەف و کوڵی ئارەزووبازییەی تێر بکات، یان کپی بکاتەوە.

جا ئەگەر پیاوێك زۆر ئارەزووباز بێت ئەوە هەرگیز نایەت ئافرەتێك لەم تەمەنەدا هەڵبژێرێت، بەڵکو ئافرەتێك هەڵدەبژێرێت کە تەواو کامڵ و پێگەیشتوو بێت، لەش و لاریشی لە رووی جنسییەوە زۆر سەرنجڕاکێش بێت، جێی حەز و تاسەی خەڵکی بێت، ناوبانگ و شۆرەتی جوانی دەرکردبێت.

بەڵام خاتوو عائیشە هیچ کام لەم سیفەتانەی تێدا نەبووە، لە هیچ ریوایەت و شوێنێکیشدا باسی جوانی و هەڵکەوتوویی جەستەیی نەکراوە، کە ئەگەر وابوایە دەبوو باس بکرایە، خۆ ئەگەر دۆستانیش باسیان نەکردایە ئەوە بەدڵنیاییەوە دوژمنان بۆ پشتڕاستکردنەوەی گومانی بەدیان لێی بێدەنگ نەدەبوون و باسیان دەکرد.

بۆیە من واهەست دەکەم کە نەك بە تەنیا خاتوو عائیشە، بەڵکو هیچ کام لەم سێ هاوسەرگیرییەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە هەتا ئێستا باسمان کردوون لە رووی غەریزەی ئارەزووبازی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ گونجاو نەبوون، جا خاتوو خەدیجە و خاتوو سەودە لە رووی زۆریی تەمەنیانەوە، خاتوو عائیشەیش لە رووی کەمی تەمەنیەوە.

ئەمەش ئەوەمان بۆ دەردەخات کە پێغەمبەری خودا ﷺ لایەنی غەریزەی جنسی شتێك نەبووە کە بیری لێ کردبێتەوە، یان خولیای بووبێت و کردبێتیە ئامانج لە هاوسەرگیرییەکانیدا.

هـەر بۆیـە هاوسـەرگیریی خـاتوو عائیـشە لەگـەڵ پێغەمبـەری خـودا ﷺ لـەم ڕووەوە ئەرك بووە و تەكلیفێكی تری پەروەردگار بووە، نـەك ویـست و خواسـتێكی تاكەكەسی.

٥ــ ئەگـەر پێغەمبــەری خــودا ﷺ كەسـێكی ئارەزووبـاز بوایــە و بـۆ ئــەو مەبەستەش خاتوو عائیشەی بهێنایە، ئەوە دەبوو لە پاش خاتوو عائیشە هیچ ژنـی تری نەهێنایە، هەموو تواناكان و كاتەكانی بۆ ئەو تەرخان بكردایە، ئارەزووەكـانی خۆی پێ تێر بكردایە.

بەڵام بە پێچەوانەوە پێغەمبەری خودا ﷺ لە پاش خاتوو عائیشەیش چەندین خێزانی تری هێنـاوە، هەموویـشیان بێـوەژن بـوون و زۆرێكیـان لـە تەمەنـدا بـوون، سەرەڕای ئەمانەیش پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر دادپەروەرانە كاتـەكان و تواناكـانی خۆی لە نێوانیاندا دابەش كـردووە، هـیچ جیـاوازی نـەكردووە لـە نێوانیانـدا و مـافی كەسی بۆ كەسـی تـر پێـشێل نـەكردووە، تەنانـەت ئەگـەر سـەفەرێكی كردبێـت بـە لایەكدا تیروپشكی كردووە لە نێوانیاندا تا بزانێت كامیان لەگـەڵ خـۆی ببـات، نـەك بە ئارەزووی خۆی یەكێكیانی هەڵبژاردبێت، یان بردبێت.

كەواتە خاتوو عائیشەیش ﷺ هەر هێنـدەی هـەر خێزانێكـی تـری بەساڵاچـوو كاتی بەركەوتووە و لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ژیاوە، لە ماوەی نۆ شەودا تـەنیا شەوێك پێغەمبەری خودا ﷺ لای ماوەتەوە.

٦ـ كاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو عائیـشەی گواسـتووەتەوە، لـە هـەموو كات زیاتر سەرقاڵ بووە بەكاری بانگەواز و جێبەجێكردنی ئەركی پێغەمبەرایـەتی و خوا لە خۆ ڕازیكردن و دروستكردنی بنەماكانی دەوڵەت لە مەدینە، تەنانەت خـاتوو عائیشە كە باس لەو شەوانە دەكات كە پێغەمبـەری خـودا ﷺ لای ئـەو ماوەتـەوە، باس لەوە دەكات كە چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ شەوەكانی بە یادی خودا زینـدوو دەكردەوە و دەفەرموێت: (... {أَنَّ نَبِيَّ اللَّهِ ﷺ كَانَ يَقُومُ مِنْ اللَّيْلِ حَتَّى تَتَفَطَّرَ

قَدَمَاهُ}[١٧]. واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە شەونوێژی دەکرد، تا قاچەکانی دەئاوسان.

بۆیە مرۆڤ کە کاتێ کەمیی تەمەنی پڕ لە فەڕی ئەو زاتە بەراورد دەکات ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو بەرهەم و دەستکەوت و دەرئەنجامە گەورانەدا، بۆی دەردەکەوێت کە ئەم زاتە چۆن و بۆچی ژیاوە و ئامانجی چی بووە؟

٧- خاڵێکی کۆتایی کە پێمخۆشە قسەی لە سەر بکەین و لە بیری نەکەین ئەوەیە کە ئایا ئامانج لە پرۆسەی هاوسەرگیریی چیە؟ کام هاوسەرگیرییە بە سەرکەوتوو پۆلێن دەکرێت؟

بەدڵنیاییەوە ئامانجی سەرەکی پرۆسەی هەر هاوسەرگیرییەك بریتییە لە پێکهێنانێکی ژیانێکی ئاسوودە و هاوبەش.

پێوەری سەرکەوتنی هەر هاوسەرگیرییەکیش بریتییە لە مەودای بەردەوامبوونی ئەو هاوسەرگیرییە، ئاسوودەیی و ڕەزامەندیی هەریەك لەو هاوسەرانە بەو هاوسەرگیرییە و ڕێژەی پێکەوە گونجان و تەباییان لەگەڵ یەکتر.

بەم پێوەرانەیش هاوسەرگیریی خاتوو عائیشە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوپەڕی سەرکەوتوو بووە، پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو عائیشەی لە هەموو خێزانەکانی زیاتر خۆش ویستووە، لە بەرامبەریشدا خاتوو عائیشە پێغەمبەری خودای ﷺ لە هەموو کەس زیاتر خۆش ویستووە، بەو ژیانەیشی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر ئاسوودە بووە و شانازیشی پێوە کردووە.

زەقترین بەڵگەی ئەم ڕاستییەش ئەوەیە کە کاتێك خێزانەکانی پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر فشاریان خستە سەر پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ ئەوەی گوزەرانیان

---

١٧ - البخاري- صحيح البخاري- ج٤/ص١٨٣٠-كتاب (٦٧) المغازي/ باب (٣٢٤) قوله: ﴿لِيَغْفِرَ لَكَ اللَّهُ مَا تَقَدَّمَ مِن ذَنبِكَ وَمَا تَأَخَّرَ وَيُتِمَّ نِعْمَتَهُ عَلَيْكَ وَيَهْدِيَكَ صِرَاطاً مُّسْتَقِيماً﴾- الحديث (٤٥٥٧). مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص٢١٧٢- كتب صفة القيامة والجنة والنار/باب (١٨) باب إكثار الأعمال والاجتهاد في العبادة- الحديث (٢٨٢٠).

باشتر بکات و داوای خۆشی و جوانییەکانی دونیایان لیٚ دەکرد، پێغەمبەری خودا ﷺ بەو قسانەیان زۆر نیگەران بوو، ئەوەبوو خوای پەروەردگار لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە وەلاّم و ئەم چەند ئایەتەی وەك سەرزەنشتێك بۆ خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ و بۆ یەکلاکردنەوەی ئەو کێشەیە ناردە خوارەوە: ﴿يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ قُلْ لأَزْوَاجِكَ إِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا فَتَعَالَيْنَ أُمَتِّعْكُنَّ وَأُسَرِّحْكُنَّ سَرَاحاً جَمِيلاً وَإِنْ كُنْتُنَّ تُرِدْنَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ فَإِنَّ اللَّهَ أَعَدَّ لِلْمُحْسِنَاتِ مِنْكُنَّ أَجْراً عَظِيماً﴾[18]. واتە: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بە خێزانەکانت بڵیٚ ئەگەر ئێوە ژیان و جوانی و خۆشییەکانی دونیاتان دەویٚ و بەلاتانەوە مەبەستە، ئەوە وەرن هەر مافێکتان دەکەوێتە لام پێتانی دەدەم و دەستان لیٚ هەڵدەگرم، ئەگەر خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ و رۆژی دواییتان پیٚ مەبەستە، ئەوە خوای پەروەردگار پاداشت و خەڵاتی زۆر گەورەی بۆ ئامادە کردوون.

لە پاش هاتنەخوارەوەی ئەم چەند ئایەتە پێغەمبەری خودا ﷺ یەکە یەکە خێزانەکانی بانگ کرد و ئەم حوکمەی خوای پیٚ راگەیاندن، سەرەتا لە خاتوو عائیشەوە دەستی پیٚ کرد، ئامادەیی خۆی نیشان دا کە دەستی لیٚ هەڵبگرێت و پێی فەرموو: (.. {يَا عَائِشَةُ إِنِّي أُرِيدُ أَنْ أَعْرِضَ عَلَيْكِ أَمْرًا أُحِبُّ أَنْ لاَ تَعْجَلِي فِيهِ حَتَّى تَسْتَشِيرِي أَبَوَيْكِ} قَالَتْ: وَمَا هُوَ يَا رَسُولَ اللَّهِ {فَتَلاَ عَلَيْهَا الآيَةَ} قَالَتْ: أَفِيكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَسْتَشِيرُ أَبَوَيَّ، بَلْ أَخْتَارُ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَالدَّارَ الآخِرَةَ)[19]. واتە: ئەی عائیشە من دەمەوێت بڕیارێکت بخەمە بەر دەست، بەس حەز دەکەم بڕیاری بەپەلەی لەسەر نەدەی، تا راوێژ بە باوك و دایکت دەکەیت، خاتوو عائیشەیش فەرمووی: ئەو بڕیارە چییە ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ کە دەتەوێت بیخەیتە بەردەست من؟ ئەویش ئایەتەکەی بۆ خوێندەوە، خاتوو عائیشە کە لە بڕیارەکە

---

١٨ - سورة الأحزاب: الآية: ٢٨- ٢٩.

١٩ - مسلم صحيح مسلم- ج٤/ص١٨٧- كتاب (١٩) الطلاق/ باب (٤) بيان أن تخيير إمرأته لا يكون طلاقا إلا بالنية- الحديث (٣٧٦٣).

گەیشت فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چۆن پرس بە باوك و دایكم دەكەم بۆ ئەوەی لەگەڵ تۆ بمێنمەوە، یان نا، بەڵكو خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ و ڕۆژی دوایی و ژیانی نەبڕاوە هەڵدەبژێرم.

كەواتە بەڕێزان ئەگەر خاتوو عائیشە لەم هاوسەرگیرییەی بچوكترین ناڕەزایی هەبوایە، یان پێی قورس و ناخۆش بوایە دەبوو قەت هەلی وای لە دەست خۆی نەدایە، یەكسەر بڕیاری جیابوونەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بدایە، بەڵام بە پێچەوانەوە لە هەموو خێزانەكانی تری زیاتر تامەزرۆ و ئارەزوومەندی بەردەوامبوونی ژیانی هاوسەرگیریی بووە لەگەڵ پێغەمبەری خودادا ﷺ، هەر بۆیەیش پێغەمبەری خودا ﷺ دواهەناسە و ساتەكانی تەمەنی لە باوەش و ئامێزی پڕ میهر و سۆز و خۆشەویستی خاتوو عائیشەدا بەسەر برد.

بۆیە هەر چەند هاوتەمەن، یان نزیكی تەمەن لە نێوان هاوسەرەكاندا هۆكارێكی گرنگە بۆ زیاتر لە یەك گەیشتن و سەركەوتنی پرۆسەی هاوسەرگیری، بەڵام هەرگیز هۆكاری سەرەكی تەبابوون و لەیەك گەیشتن نییە، بە شێوەیەك خەڵكی وای بخەملێنن كە هەر هاوسەرگیرییەك هاوسەرەكان تێیدا هاوتەمەن نەبن ئیتر ئەو هاوسەرگیرییە سەركەوتوو نییە، یان بەزۆر سەپاوە.

نموونەی هاوسەرگیریی پێغەمبەری خودایش ﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشە زەقترین بەڵگەی ئەم ڕاستیەن، لەبەرامبەریشدا ڕۆژانە بەچاوی خۆمان شكست و داڕووخانی چەندین پرۆسەی هاوسەرگیریی دەبینین و دەبیستین، كە زۆر بەداخەوە هاوسەرەكان تێیدا هاوتەمەنیشن.

بۆیە بەگشتیی و بە هەموو پێوەرەكان هاوسەرگیریی پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو عائیشە هاوسەرگیرییەكی زۆر سەركەوتوو بووە، ئامانجی زۆر گەورە و بە بەهای لە پشتەوە بووە، گەورەترینیان جێبەجێكردنی فەرمانی خودا و ڕوونكردنەوەی حوكمی شەرع كە كەمیی تەمەن و بیرتیژیی خاتوو عائیشە هۆكارێكی زۆر لەبار بووە بۆ ئەوەی زۆرترین فەرموودەو سوننەتی پێغەمبەر ﷺ

لەبەر بكات و بۆ موسڵمانانی بگێڕێتـەوە، هـەر ئەمـەیش وای كـردووە كـە لەگـەڵ كەمیی تەمەنیشیدا پسپۆڕترین و شارەزاترینی كەسـی نێـوان هـاوەڵانی پێغەمبـەر ﷺ و كۆمەڵگای ئیسلامیی سەردەمی خۆی بێت.

## خێزانی چوارەم:

- خێزانی چوارەمی پێغەمبەر ﷺ دیسانەوە ئافرەتێكی بێوەژن بووە بە ناوی خـاتوو: (حَفْصَةُ بِنْتُ عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ الْعَدَوِيَّة)ە ، دایكیـشی نـاوی (زَيْنَب بنت مَظْعُون)ە.

- خاتوو حەفـصە كـچی جێنـشینی دووەمـی پێغەمبـەری خـودا ﷺ (عُمَرَ بْنِ الْخَطَّابِ) و لە باوكەوە خوشكی (عَبْدَ اللهِ بْنَ عُمَرَ) بووە.

- پێـنج سـاڵ بـەر لـە پێغەمبەرایـەتی پێغەمبـەر ﷺ، لـەو كاتـەی قـوڕەیش سەرقاڵ بوون بە دروستكردنەوەی كەعبەوە خـاتوو حەفـصە لـە دایـك بـووە، واتـە هەژدە ساڵ بەر لە كۆچی پێغەمبەر ﷺ بەرەو مەدینە لە دایك بووە.

- بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ، خاتوو حەفـصە خێزانـی هـاوەڵێكی بەڕێز و ئازیز بووە بە ناوی (خُنَيْسِ بْنِ حُذَافَةَ السَّهْمِيِّ)، پێكـەوە كۆچـیان كـردووە بەرەو مەدینـە، پاشـتر (خُنَـيْس) لـە جـەنگی بـەدردا بـە خەسـتی برینـدار دەبێـت، بەهۆی سەختی برینەكەیەوە پاش كۆتایی شەڕەكە لە شاری مەدینە كۆچـی دوایـی دەكات.

- بە بێوەژنكەوتنی خاتوو حەفصەی كچی، ئیمامی عومەر زۆر دڵگران دەبێـت، وەك ئەركێكی ئیسلامەتی و باوكایەتی و بیّ گوێدانە دابونەریتی سەردەمی نەفامی، هەوڵ دەدات كە خاتوو حەفصە بەو شێوەیە نەمێنێتەوە، هەر بۆیە خۆی دەچـێتە لای عوسمـانی كـوڕی عـەففان (رەزای خوایـان لـیّ بێـت) و پێـشنیاری ئـەوەی بـۆ دەكات كە خـاتوو حەفصە مارە بكات، بـەڵام عوسمـان دەڵێـت: مۆڵـەتم بـدەریّ بـا بیری لێبكەمەوە، پاش چەند رۆژێك دێت و پێی دەڵێت: ئـارەزوی ژن هێنـانم نییـە،

پاشان عومەر دەگاتە خزمەتی ئەبوبەکری صدیق (ڕەزای خوایان لێ بێت) و پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکات کە خاتوو حەفصە مارە بکات، ئەویش بێدەنگ دەبێت و هیچ وەڵامی ناداتەوە، پاش ماوەیەك پێغەمبەری خودا ﷺ داوای دەکات و مارەی دەکات. پاشتر ئەبوبەکر و عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) بەیەکتر دەگەن، ئەبوبەکر پێی دەفەرموێت: لەوانەیە ئەو ڕۆژە دڵت گران بووبێت کە وەڵامم نەدایتەوە، ئەویش فەرمووی: بەڵێ پێم ناخۆش بوو، ئەبوبەکریش فەرمووی: من دەمزانی پێغەمبەری خودا ﷺ بەتەمایەتی و لای من باسی کردبوو، جا من پێم خۆش نەبوو نهێنی پێغەمبەر ﷺ بدرکێنم، ئەگەر ئەو نەیویستایە من دەمویست و مارەم دەکرد.

- پاش سێ مانگ لە کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، لە مانگی شەعبانی ساڵی سێی کۆچی، بەر لە جەنگی ئوحود پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو حەفصەی مارە کردووە و ژیانی هاوسەری لەگەڵ دەست پێکردووە، ئەو کات خاتوو حەفصە تەمەنی بیست ساڵان بووە.

- خاتوو حەفصە یەکێك بووە لەو ئافرەتە بەهیممەتانەی کە بە هەوڵی خۆی و لەو سەردەمانەدا لەسەر دەستی شیفائی کچی عەبدوڵلا خۆی فێری خوێندەواری کردووە، وەك لێی دەگێڕنەوە خاتوو حەفصە خوێندەوارێکی زیرەك و وتاربێژێکی زۆر بەتوانا بووە، دەستی شیعر و ڕەوانبێژیشی هەبووە.

- کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ لە خێزانەکانی تووڕە دەبێت لەسەر ئەوەی داوای نەفەقەی زۆری لێدەکەن، خاتوو حەفصە تەڵاق دەدات، بەڵام خاتوو حەفصە ئەوەندە خواناس و باوەڕدار بووە، خوای پەروەردگار لەسەری دێتە وەڵام و بەجبریل دا وەڵام بۆ پێغەمبەر ﷺ دەنێرێت و فەرمانی پێ دەکات کە خاتوو حەفصە بگێڕێتەوە لای خۆی، پێغەمبەری خودا ﷺ لەو بارەیەوە دەفەرموێت: {إِنَّ جِبْرِيل أَتَانِي فَقَالَ لِي: رَاجِع حَفْصَة" فَإِنَّهَا صَوَّامَة قَوَّامَة، وَهِيَ زَوْجَتك فِي

الْجَنَّةِ}[٢٠]. واته: جبریل هاته لام و پێی گوتم: خاتوو حەفصە بگێڕەرەوە لای خۆت، چونکە خاتوو حەفصە ئافرەتێکە بەردەوام سەرقاڵی نوێژ و ڕۆژووگرتنە و یەکێکە لە خێزانەکانت لە بەهەشتدا.

- هەر لەبەر زیرەکی و دەستپاکی کاتێك لە سەردەمی جێنشینی ئەبوبەکردا بۆ یەکەمجار قورئان کۆ کراوەتەوە، هەتا ئەبوبەکر لە ژیاندا بووە ئەو قورئانە لای ئەو پارێزراوە، پاش کۆچی دوایی ئەبوبەکر ئەو قورئانە لای ئیمامی عومەر بووە، پاش شەهید کردنی ئیمامی عومەر ئەو قورئانە لای خاتوو حەفصە پارێزراوە، هەتا سەردەمی ئیمامی عوسمان و پاشتر ئەو داوای لێدەکات کە ئەو قورئانەیان بۆ ڕەوانە بکات، بۆ ئەوەی چەند وێنەیەکی لەبەر بنووسنەوە و دابەشی بکەن بەسەر موسڵمانان و شوێنە جیاجیاکاندا، پاشتر قورئانەکەی بۆ دەگێڕێتەوە و هەتا کۆچی دوایی دەکات ئەو قورئانە لای ئەو دەمێنێتەوە.

- لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ خاتوو حەفصە شەست فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە، لەوانە بوخاری و موسلیم لەسەر گێڕانەوەی چواریان کۆك بوون، جگە لەو چوارەیش موسلیم بەتەنیا شەش فەرموودەی تری لە صەحیحەکەیدا باس کردووە، سەرجەم فەرموودەکانی تر لە سەرچاوەکانی تری فەرموودەدا باس کراون و گێڕدراونەتەوە.

- خاتوو حەفصە لە مانگی شەعبانی ساڵی چل و پێنجی کۆچی، لە تەمەنی شەست ساڵی لە سەردەمی پێشەوایەتی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان (ڕەزای خوایان لێ بێت) لە مەدینە کۆچی دوایی کردووە، خەڵکێکی زۆر لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ بە پێشەوایەتی مەڕوانی کوڕی حەکەم کە ئەو کات والی مەدینە

---

[٢٠] - الهيثمي (نور الدين علي بن أبي بكر الهيثمي)- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد- ج٩/ص١٩٥- دار الفكر/ بيروت- ط/١٩٩٢- الحديث (١٥٣٣٣)- وبهامش الكتابين تحرير الحافظين: العراقي، وابن حجر والحديث رواه الطبراني ورجاله رجال الصحيح. المناوي (زين الدين عبد الرؤوف المناوي)- التيسير بشرح الجامع الصغير- ج٢/ص٣٧٤- مكتبة الإمام الشافعي/ الرياض- ط٣/١٩٨٨.

بووه نوێژیان له سەر کردووه، هەر له مەدینه و له گۆڕستانی بەقیع تەرمی پیرۆزی به خاك سپێردراوه.

- ئامانجی پێغەمبەری خودا ﷺ له هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو حەفصه دڵنەواییکردن و وەفادارییەك بووه بۆ ئیمامی عومەر کە بە بێوەژنکەوتنی خاتوو حەفصه زۆر دڵگران بووه، هەروەها توندوتۆڵکردنی پەیوەندی خێزانی بووه لەگەڵ ئەو پیاوه بەڕێزەی کە دەبێتە جێنشینی دووەمی، بۆیە ئەگەر سەرنج بدەین دەبینین هەر چوار جێنشینەکانی پێغەمبەر (ڕەزای خوایان لێ بێت)، جگە لە پەیوەندی توندوتۆڵی ئیمان و باوەڕیان لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ پەیوەندی خێزانیی لەگەڵیان بەستووه، بۆ نموونه کچی لە ئەبوبەکر و عومەر خواستووه، کچیشی داوەتە عوسمان و عەلی (ڕەزا و ڕەحمەتی خودا لە هەموویان بێت).

## خێزانی پێنجەم:

- خێزانی پێنجەمی پێغەمبەر ﷺ خاتوو (زَيْنَبَ بِنْتَ خُزَيْمَةَ بْنِ الْحَارِثِ)ە، دایکیشی ناوی (هِنْد بِنْت عَوْف)ە.

- هەرچەند له ڕووی ژمارەوه خاتوو زەینەب بە خێزانی پێنجەمی پێغەمبەر ﷺ ئەژمار دەکرێت، لەبەر ئەوەی بەر لەئەو پێغەمبەری خودا ﷺ چوار خێزانی تری هێناوه، بەڵام لەواقیعدا خێزانی چوارەمی پێغەمبەر ﷺ بووه، چونکه پێشتر خاتوو خەدیجە کۆچی دوایی کردبوو، پێغەمبەری خودا ﷺ تەنیا سیان لە خێزانەکانی له ژیاندا مابوون.

- خاتوو زەینەبیش وەك زۆرینەی خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بێوەژن بووه، هەر چەندە هەندێك لە مێژوونووسان وای بۆ دەچن کە خاتوو زەینەب بەر له پێغەمبەر ﷺ خێزانی (عَبْدِ الله بْنِ جَحْشٍ) بووه و هاوسەرەکەی لە شەڕی ئوحوددا شەهید بووه، بەڵام زۆرینەی زانایان و مێژوونووسان ئەم بۆچوونه

ڕەت دەکەنەوە و دەڵێن: خاتوو زەینەب بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ خێزانی (الطُفَيْلِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ)ی ئامۆزای خۆی بووە، پاشتر ئەو تەڵاقی داوە و ئامۆزایەکی تری بە ناوی (عُبَيْدَةَ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ) مارەی کردووە، پاشتر (عُبَيْدَةَ) لە غەزای بەدردا و لە یەکەم ڕووبەڕووبونەوەی نێوان بەرەی باوەڕداران و بێباوەڕان لە سەر دەستی (وَلِيدَ بْنَ عُتْبَةَ) بەخەستی بریندار بووە و پاشتر شەهید بووە.

- پاش بێوەژنکەوتنی، خاتوو زەینەب بیر لە شووکردن دەکاتەوە، خۆی پێشنیازی ئەوە بۆ پێغەمبەر ﷺ دەکات کە بیخوازێت، ئەو یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی کە خۆی بەخشیوەتە پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەویش وەك وەفایەك بۆ بەئەمەکی خاتوو زەینەب، داواکەی ڕەت ناکاتەوە و پاش تێپەڕبونی سی و یەك مانگ بەسەر کۆچی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەدینە، لە مانگی ڕەمەزانی ساڵی سێی کۆچی، پێغەمبەری خودا ﷺ ژیانی هاوسەری لەگەڵ خاتوو زەینەب دەست پێدەکات.

- خاتوو زەینەب ئەوەندە ئافرەتێکی بە بەزەیی و بەخشندە بووە بەرامبەر بە هەژاران، هەر لە سەردەمی نەفامییەوە و بەر لەوەیش ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ نازناوی بە (أُمّ الْمَسَاكِينِ) واتە دایکی هەژاران دەرکردبوو.

- بەداخەوە ژیانی خێزانی خاتوو زەینەب لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ زۆری نەخایاندووە و زۆربەی مێژوونووسان لەسەر ئەوەن کە خاتوو زەینەب تەنیا دوو تا سێ مانگ لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ژیاوە و پاشتر لە مانگی ڕەبیعی دووەمی ساڵی چواری کۆچی، کۆچی دوایی کردووە.

- پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی نوێژی مردووی لەسەر تەرمی پیرۆزی خاتوو زەینەب کردووە، ئەمەیش یەکێك بووە لەو بەخششانەی کە خوای گەورە لەگەڵ خاتوو زەینەبی کردووە، پاشتر تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە.

ـ لەبەر کەمی ماوەی مانەوەی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ، خاتوو زەینەب هیچ فەرموودەیەکی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ نەگێڕاوەتەوە.

### خێزانی شەشەم:

ـ خێزانی شەشەمی پێغەمبەر ﷺ خاتوو (هِنْدُ بِنْتُ أبِي أُمَيَّةَ)یە، دایکیشی ناوی (عَاتِكَة بنت عَامِر)ە.

ـ خاتوو هیند خزمی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی بووە، بە حەوت پشت نەسەبی لەگەڵ نەسەبی پێغەمبەر ﷺ یەك دەکاتەوە.

ـ باوکی خاتوو هیند ئەوەندە پیاوێکی بەخشندە بووە هەرکەسێك لەگەڵی سەفەری کردبێت بۆ هەر شوێنێك هیچ توێشووی لەگەڵ خۆی نەبردووە و ئەو هەموو ئەرك و خزمەتێکی هاوەڵەکانی گرتووەتە ئەستۆ، هەر بەو هۆیەشەوە لە ناو عەرەبدا نازناوی بە (زاد الرَّاكِب) واتە: توێشوی رێبواران دەرکردبوو.

ـ بەر لە پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو هیند خێزانی ئامۆزایەکی خۆی بووە بە ناوی (عَبْدُ اللّه بْنُ عَبْدِ الأسَدِ) و ئەو پیاوە بەرێزە برای شیریی پێغەمبەر ﷺ و پورزایشی بووە، یازدەهەمین کەس بووە کە باوەڕی بە پێغەمبەر ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام هێناوە، لە بەرهەمی ئەم هاوسەرگیرییەیان خوای پەروەردگار منداڵێکیان پێ دەبەخشێت ناوی دەنێن (سَلَمَة) و ئیتر خاتوو هیند و عەبدوڵڵای هاوسەری وەکو نەریتێکی کۆمەڵایەتی ئەو کاتە بە (أُمُّ سَلَمَة) و (أَبُو سَلَمَة) دەناسرێن.

ـ خاتوو (أُمُّ سَلَمَة) و (أَبُو سَلَمَة)ی هاوسەری یەکێك بوون لەو خانەوادانەی کە هەر لەسەرتاوە باوەڕیان بە بەرنامەی پیرۆزی ئیسلام هێناوە، لەو پێناوەشدا قوربانیی زۆریان داوە و کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە، پاشتر کە لە حەبەشە گەڕاونەتەوە تووشی نەهامەتیەکی زۆر هاتوون بەدەست بێباوەڕانی مەکەوە، پاشتر ویستویانە کۆچ بکەن بۆ مەدینە، خۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

کاتێك لەگەڵ هاسەرەکەم بڕیاری کۆچکردنمان دا بەرەو مەدینە، خزمەکانی من ڕێگەیان بە هاوسەرەکەم گرت و وتیان: ئەوە خۆت کۆچ دەکەیت بەهەر حاڵ دەسەڵاتی تۆمان نییە، بەڵام پێمان ناڵێی ئەم کچەی ئێمە شارە و شار دەگێڕی لە پای چی، پاشتر جڵەوی وشترەکەیان کردەوە و من و کوڕەکەمیان گل دایەوە، کە خزمەکانی هاوسەرەکەم بەمەیان زانی ئەوانیش تووڕە بوون و وتیان: چۆن ئەوان نەیانهێشتووە کچەکەیان لەگەڵ کوڕەکەی ئێمە بڕوات، ئێمەش قبوڵ ناکەین منداڵی ئێمە لای ئەوان بێت، هاتن کوڕەکەم لێ بسەننەوە، بووە دەمەقاڵە و دەمە بۆڵەیان لەگەڵ کەس و کاری من و لەو کێشمان کێشەدا دەستی کوڕەکەیان لە جێ بردم، بەهەر حاڵێك بوو کوڕەکەیان لێ سەندمەوە، منیش هەموو ڕۆژێك بەیانیان دەهاتمە دەرەوەی ماڵەکەمان و دەستم دەکرد بەگریان هەتا ئێوارە خۆر ئاوا دەبوو، بۆ ماوەی یەك ساڵ من لەسەر ئەو حاڵە مامەوە، تا ڕۆژێکیان ئامۆزایەکم سۆزی جوڵاو بەزەیی بە حاڵمدا هاتەوە و بە کەس و کارەکەمی وت: بۆ وا لەو بەستەزمانە دەکەن و لە منداڵ و هاوسەرەکەیتان کردووە؟ پاشان کەس و کارەکەم قەناعەتیان کرد و وتیان: ئەگەر دەتەوێت بڕۆ بۆ لای هاوسەرەکەت، خزمەکانی هاوسەرەکەیشم کە ئەمەیان بیست کوڕەکەیان بۆ گێڕامەوە، پاشتر بەتەنیا لەگەڵ کوڕەکەم کۆچمان کرد بۆ مەدینە، وەك زانایان باس دەکەن یەکەم ئافرەت بووە کە کۆچی کردووە بۆ مەدینە.

- پاشتر (أَبُو سَلَمَة) لە غەزای ئوحوددا بە خەستی برینداد دەبێت، بەهۆی خەستی برینەکەیەوە پاش ماوەیەك شەهید دەبێت، خاتوو (أُمُّ سَلَمَة) لە ساڵی چواری کۆچی و لە تەمەنی سی ساڵیدا بە چوار منداڵەوە بێوەژن دەکەوێت.

- پاش بێوەژنکەوتنی خاتوو (أُمُّ سَلَمَة) ئەبوبەکری صدیق و عومەری کوڕی خەتابیش (ڕەزای خوایان لێ بێت) داوای دەکەن، بەڵام شوو بە کەسیان ناکات، پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ داوای دەکات، ئەویش لە وەڵامدا دەڵێت: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من هاوشانی تۆ نیم، من کۆمەڵێك سیفەتم تێدایە کە بۆ تۆ

ناشێم: یەکەم: مـن ئـافرەتێکم چـومەتە ساڵەوە و تەمـەنێکم هەیـە، دووەم: بڕێـك منداڵیشم هەیە، سێیەمیش: ئافرەتێکی زۆر هەستیاریشم و غـیرە لـە ئـافرەتی تـر دەکەم و دەترسم هەڵوێستێکم لیّ ببینی و پێت ناخۆش بێت و پاشـتر خـوا بـەهۆی ئەوەوە سزام بدات، پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامـی قسەکانیدا فـەرمووی: {أَمَّا السِّنُّ فَأَنَا أَكْبَرُ مِنْك، وَأَمَّا الأَطْفَالُ فَهُمْ إِلَى اللَّهِ وَرَسُولِه، وَأَمَّا الْغَيْرَةُ فَأَدْعُو اللَّهَ فَيُذْهِبُهَا عَنْك}. ئەگـەر کێـشەکە تەمـەن و بەساڵاچوون بێـت ئـەوە مـن لـە تـۆ بەساڵاچووترم، سەبارەت بە منداڵەکانیش ئەوە خواو پێغەمبەر لێیان بێئاگا نـابن و لە ژێر چاودێری ئەواندا دەبن، سەبارەت بەوەش کـە زۆر غـیرە دەکـەیت ئـەوە داوا دەکەم لە خوای گەورە کە ئەو شتە لە دڵتدا لا ببات[٢١].

- پێغەمبەری خودا ﷺ لە کۆتاییەکانی مانگی شەووالی ساڵی چواری کۆچـی ژیانی هاوسەری لەگـەڵ خـاتوو (أُمُّ سَلَمَة)دا دەسـت پێکـردووە، بـەم شێوەیەیش خاتوو (أُمُّ سَلَمَة) دەبێتەوە خێزانی چوارەمی پێغەمبەر ﷺ، لەبەر ئـەوەی کاتێـك پێغەمبـەری خـودا ﷺ خـاتوو (أُمُّ سَلَمَة)ی خواسـتووە، خـاتوو زەینـەبی کـچی خوزەیمـە لـە ژیانـدا نـەماوە و لـە جێگەکـەی خـاتوو زەینـەب خـاتوو (أُمُّ سَلَمَة) نیشتەجیّ دەبێت.

- خاتوو (أُمُّ سَلَمَة) ئافرەتێکی زۆر جوان و ژیـر و بیرتیـژ بـووە، شـارەزاییەکی باشیشی هەبووە لە بابەتە فیقهی و شەرعییەکاندا، لە ماوەی تەمەنی پڕ لە فەرپـدا سێسەد و حەفتا و هەشت فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە، کە بوخاری و موسلیم لە سەر گێڕانەوەی سیازدەیان کۆك بوون.

---

٢١ - إبن الجارود (عبد الله بن علي بـن الجـارود)- المنتقـى مـن الـسنن المـسندة -ص١٧٧- مؤسـسة الكتاب الثقافيـة/ بيروت- ط١٤٠٨/١- تحقيق: عبدالله عمر البارودي. أبـو يعلـى (أحمـد بـن علـي بـن المثنـى)- مـسند أبـي يعلـى - ج٧/ص١٨٠- دار المـأمون للـتراث/ دمـشق- ط١٤٠٤/١- الحـديث (٤١٦١)- تحقيق: حسين سليم أسد.

ـ وەك زانایـانی فـەرمووده و مێژوونووسـان بـاس دەكـەن خـاتوو (أُمُّ سَـلَمَة) نزیكەی هەشتا و نۆ ساڵ ژیاوه، پاشـتر لـه سـاڵی شەسـت و یـەكی كۆچـی و پـاش هـەموو خێزانـەكانی پێغەمبـەر ﷺ لـە سـەردەمی فـەرمانڕەوایی یەزیـدی كـوڕی موعاویه، پاش ئەوەی كه هەواڵی شەهیدكردنی حسەینی كوڕی عەلی و هاوەڵەكانی پیٚ دەگات دەكەوێتـه سەر زەوی و لـەهۆش خـۆی دەچـێت و پـاش چـەند رۆژێـك كۆچی دوایی دەكات، تەرمی پیرۆزی له گۆڕستانی بەقیع بەخاك دەسپێردرێت.

**خێزانی حەوتەم:**

ـ خێزانی حەوتەمی پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێكی ناوداری قوڕەیش بووه به ناوی: (زَیْنَبَ بِنْت جَحْشٍ بْنِ رِئَابٍ) دایكیشی ناوی (أُمَیْمَةُ بِنْتُ عَبْدِ الْمُطَّلِبِ بْنِ هَاشِمٍ)ە.

ـ خـاتوو زەینـەب پـوورزای پێغەمبـەر ﷺ خۆیـەتی، خوشـكی (عبـدالله بـن جَحْش)ە كه هەڵگری یەكەم ئاڵای ئیسلامیی بووه، خوشكەزای سەروەری شەهیدان (حَمْزَةَ بْنُ عَبْدِ الْمُطَّلِب)ة.

ـ خاتوو زەینەب له منداڵییدا ناوی (بَرَّة) بووه، بـەڵام پێغەمبـەر ﷺ ناوەكـەی گۆڕیوه بـه زەینـەب، چـونكه وشـەی (بَـرَّة) واتـای بەخشنده و چاكەكاره، خـوای گەورەش دەفەرموێت: ﴿فَلا تُزَكُّوا أَنْفُسَكُمْ هُـوَ أَعْلَـمُ بِمَـنِ اتَّقَـى﴾[٢٢]. واتـه: خۆتـان وەسـفی خۆتـان مەكـەن و خۆتـان بـه بـاش لـه قەڵـەم مـەدەن، چـونكه هـەر خـوا دەزانێت كیٚ باشه و لەخواترسه؟

ـ بەر لـه پێغەمبـەری خـودا ﷺ، خـاتوو زەینـەب خێزانـی هـاوەڵێكی ئـازیز و خۆشەویستی پێغەمبەر بوو ﷺ، به ناوی (زَیْدِ بْنِ حَارِثَة) ئـەم پیـاوه بـەڕێزه هـەر به منـداڵی كۆیلـه دەكرێـت و لـه بـازاڕی عوكـاز دا دەفرۆشـرێت و حـەكیمی كـوڕی حوزام به چوارسەد درهەم بۆ خەدیجەی كچی خوەیلدی پووری دەكرێت، پاشتر كه

---

٢٢ - سورة النجم: الآیة: ٣٢.

خاتوو خەدیجە دەبێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ دەیبەخشێتە پێغەمبەر ﷺ، زەید ئەو کاتە تەمەنی هەشت ساڵان دەبێت، ماوەیەکی زۆر زەید لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەمێنێتەوە، تا ساڵێکیان خەڵکانێك لە بنەماڵەی زەید دێن بۆ مەککە و لەوێ زەید دەبینن و دەیناسنەوە، دەچن هەواڵ بۆ کەس و کاری دەبەنەوە، ڕۆژێك (حَارِثَة)ی باوکی و (کَعْب)ی مامی دێنە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و داوای ئەوە دەکەن کە کوڕەکەیان پێ بفرۆشێتەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ لە وەڵامدا دەفەرموێت: زەید بانگ بکەن ئەگەر ڕازی بوو لەگەڵتان بگەڕێتەوە ئەوە من ڕێگری لێ ناکەم و دەتاندەمەوە، بەڵام ئەگەر ویستی لەگەڵ من بمێنێتەوە ئەوە نابێت ئێوەش ڕێگری لێ بکەن، کاتێك زەیدیان بانگ کرد، زەید وتی: لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەمێنمەوە، باوکی زۆری پێ ناخۆش بوو، وتی: سەرسەخت چۆن کۆیلایەتی بەسەر ئازادییدا هەڵدەبژێریت، ئەویش لە وەڵامدا وتی: وەڵڵاهی ئەوەندەم چاکە لەم پیاوە بینیوە، بۆ هیچ کەسێك ئەو جێ ناهێڵم، پێغەمبەری خودا ﷺ کە ئەم هەڵوێستەی زەیدی بینی دەستی گرت و بردیە دەرەوە و فەرموویی: خەڵکینە ئێوە بە شایەت بن زەید کوڕی منە و میراتم لێ دەبات و منیش میرات لەو دەبەم، بەم شێوەیە پێغەمبەری خودا ﷺ زەیدی لە کۆیلەیی ڕزگار کرد و ئازادی کرد و کردیە کوڕی خۆی، ئیتر لە ناو خەڵکدا هەر بە زەیدی کوڕ موحەممەد دەناسرا[٢٣].

ـ پاش ئەوەی کە ئیسلام یاسای بەکوڕکردنی هەڵوەشاندەوە، وەك قەرەبوویەك بۆ ئەوەی کە نەسەبی زەید لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ هەڵوەشایەوە، خوای پەروەردگار لە قورئاندا ناوی زەیدی تۆمار کرد، لە کاتێکدا هیچ هاوەڵێکی تری پێغەمبەر ﷺ تەنانەت ئەبوبەکر و عومەریش (ڕەزای خوایان لێ بێت) ناویان لە قورئاندا نەهاتووە و باس نەکراون.

---

٢٣ - إبن حجر العسقلاني ( أحمد بن علي بن محمد)- فتح الباري شرح صحيح البخاري- ج٧/ص٨٧- دار الفكر/ بيروت- تحقيق: عبد العزيز بن عبد الله بن باز، ومحب الدين الخطيب.

- پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە زەیدی خۆشدەویست لە ناو موسڵماناندا بە خۆشەویستی پێغەمبەر ﷺ دەناسرا و بانگ دەکرا، هەر بە هۆی ئەو خۆشەویستییەوە بوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ منداڵەکانی زەیدیشی هەر خۆشدەویست، بۆیە بە ئوسامەی کوڕی زەیدیشیان دەوت: (الحبُّ ابن الحبِّ). واتە: خۆشەویستی کوڕی خۆشەویست، عەبدوڵڵای کوڕی عومەر دەفەرموێت: جارێکیان باوکم پارەی دابەش دەکرد، لە من زیاتری دا بە ئوسامەی کوڕی زەید، منیش پرسیارم لێ کرد و وتم: بابە بۆچی زیاتر دەدەیتە ئەو؟ ئیمامی عومەریش لە وەڵامدا فەرمووی: کوڕم پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوی لە تۆ زیاتر خۆشدەویست، باوکیشی لە باوکی تۆ زیاتر خۆشدەویست.

- کاتێك زەید گەورە دەبێت، پێغەمبەری خودا ﷺ بیری لەوە کردەوە کە ژنی بۆ بهێنێت، سەرەتا ئافرەتێکی بۆ خواست بە ناوی (أمَّ أيمن) زەید لەو ئافرەتە (أُسَامَةَ)ی بوو، پاشتر زەید (أمَّ أيمن)ی تەڵاق دا و لێی جیا بووەوە، پاش ئەو پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو زەینەبی بۆ هەڵبژارد کە پوورزای خۆی بوو، کچی یەکێك بوو لە هەرە بنەماڵە ناودارەکانی قورەیش، ئافرەتێکی زۆر هەڵکەوتوو جوان بوو.

- کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ چووە داوای خاتوو زەینەب و باسی هاوسەرگیریی لەگەڵ کردەوە، سەرەتا خاتوو زەینەب زۆری پێ خۆش بوو چونکە وای دەزانی کە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ خۆی داوا دەکات، بەڵام دواتر کە پێغەمبەری خودا ﷺ پێشنیازی زەیدی بۆ کرد زۆری پێ ناخۆش بوو، زەیدی بە هاوشانی خۆی نەدەبینی، راوێژی بە عەبدوڵڵای برای کرد، ئەویش هەر هەمان هەڵوێستی هەبوو، پێی ناخۆش بوو خوشکەکەی شوو بە کەسێك بکات کە کاتی خۆی کۆیلە بووە، پاشتر وەك رێزلێنانێك لە پێشنیازەکەی پێغەمبەر ﷺ و جەخت کردنەوە لە سەر هەڵوێستەکەی خوای پەروەردگار ئایەتی لەسەر پێشنیازەکەی پێغەمبەر ﷺ و هەڵوێستەکەی ئەوان ناردە خوارەوە و لەو بارەیەوە فەرمووی:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ وَمَنْ يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ ضَلَّ ضَلالاً مُبِيناً﴾[٢٤]. واتە: هیچ باوەڕدارێك بۆی نییە كە خوا و پێغەمبەری خودا ﷺ بڕیارێكیان دا جگە لە بڕیارەكەی ئەوان شتێكی تر پەسەند بكەن، یان بڕیارێكی تر بدەن، پاش هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە خاتوو زەینەب فەرمووی: سەرپێچی فەرمانی خودا و پێغەمبەری خودا ﷺ ناكەم، شووی پێ دەكەم، ئیتر خاتوو زەینەب و عەبدوڵڵای برای ڕازی بوون لەسەر پێشنیازەكەی پێغەمبەر ﷺ و خاتوو زەینەب شووی بە زەید كرد.

- ژیانی هاوسەری خاتوو زەینەب لەگەڵ زەید سەركەوتوو نەبوو، بەهۆی ئەوەی كە خاتوو زەینەب زەیدی بە شایەن و هاوشانی خۆی نەدەبینی، سروشتیشی وا بووە كە زۆر زوو توڕە بووە، بۆیە هەر لە سەرەتاوە كێشە و ناكۆكی كەوتە نێوانیانەوە و هەموو جار زەید دەهاتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و سكاڵای لە دەست خاتوو زەینەب دەكرد و دەیوت: زەینەب زۆر توندە لەگەڵم و دەمەوێت لێی جیا ببمەوە، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو جارێك ئامۆژگاری دەكرد و ساردی دەكردەوە و دەیوت: لە خوا بترسە و ئارامی لەگەڵ بگرە و تەڵاقی مەدە، ئەمە لە كاتێكدا بوو كە پێغەمبەری خودا ﷺ سوور دەیزانی و جبریل ئاگاداری كردبووەوە كە زەید زەینەب هەر تەڵاق دەدات، پاشتر دەبێت خۆی بیخوازێت.

- هەرچەندە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ڕاستییەشی دەزانی، بەڵام ئەم كارەی زۆر بەلاوە قورس بوو، لە قسەی خەڵكی دووڕوو و بێباوەڕ زۆر دەترسا كە بڵێن: موحەممەد ﷺ خێزانی كوڕەكەی خۆی مارە كردووەتەوە، بۆیە ئەمەی بە كەس نەدەگوت و ڕاینەدەگەیاند، لەگەڵ ئەوەیشی كە خوای پەروەردگار بەر لەم كێشەیەیش ئەو یاسا و دابونەریتەی سەردەمی نەفامی هەڵوەشاندبووەوە و یاسای

---

[٢٤] - سورة الأحزاب: الآية: ٣٦.

بەکوڕکردنی پوچەڵ کردبووەوە و لەو بارەیەشەوە ئایەتی ناردبووە خوارەوە کە تێدایدا هاتبوو: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ﴾[٢٤]. واتە: خوای پەروەردگار ئەو منداڵانە بە کوڕی ئێوە ئەژمار ناکات کە ئێوە خۆتان دەیانکەنە کوڕی خۆتان و نەسەبیان دەدەنە پاڵ خۆتان، ئەوە تەنیا قسەی زارەکی ئێوەیە و لە ڕاستییدا ئەوانە کوڕی ئێوە نین، ڕاستی لەوەدایە کە خوای پەروەردگار دەیفەرموێت، هەر ئەویش ڕێگای ڕاستتان پیشان دەدات، ئەو کەسانەی کردوتانن بە کوڕی خۆتان بە ناوی باوکی خۆیانەوە بانگیان بکەن، ئەوە باشتر و دادوەرانەترە.

بەڵام سەرەڕای ئەم فەرموودە ڕوون و ئاشکرایانەش خەڵکانێك هەبوون هێشتا شوێنەواری ئەو یاسا نەفامیەیان هەر لەدڵدا مابوو، بۆیە پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر لەوە دەترسا کە دوژمنان و ناحەزانی ئەم هەڵە بقۆزنەوە و بیکەنە ڕەخنە و تانەیەك بەسەر پێغەمبەرەوە ﷺ، هەتا کار گەیشتە ئەوەی کە خوای پەروەردگار لەسەر ئەم کێشەیە ڕاشکاوانە گلەیی لە هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بکات و چەند ئایەتێك لەم بارەیەوە بنێرێتە خوارەوە و تێیدا بفەرموێت: ﴿وَإِذْ تَقُولُ لِلَّذِي أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِ وَأَنْعَمْتَ عَلَيْهِ أَمْسِكْ عَلَيْكَ زَوْجَكَ وَاتَّقِ اللَّهَ وَتُخْفِي فِي نَفْسِكَ مَا اللَّهُ مُبْدِيهِ وَتَخْشَى النَّاسَ وَاللَّهُ أَحَقُّ أَنْ تَخْشَاهُ﴾. (سورة الأحزاب:٣٧). واتە: کە تۆ بەو کەسەت دەوت – دیارە مەبەست لەو کەسە زەیدە– کە خوا چاکە و بەخششی زۆری لەگەڵ کردووە و تۆیش چاکە و بەخششت لەگەڵ کردووە، لە خوا بترسە و خێزانەکەت تەڵاق مەدە، شتێك دەشاریتەوە و پەنهانی دەکەیت کە خوا دەیەوێت ئاشکرای بکات، لە قسەی خەڵکی دەترسیت، لە کاتێکدا خوا زیاتر شایەنی ئەوەیە کە تۆ لێی بترسیت.

---

[٢٤] - سورة الأحزاب: الآية: ٤-٥.

- ژیانی هاوسەری زەید لەگەڵ خاتوو زەینەب ڕۆژبەڕۆژ زیاتر ڕووی لە گرژی و ئاڵۆزی دەکرد، تا سەرئەنجام زەید لە خاتوو زەینەب جیا بووەوە.

- پاش ئەوەی زەید خاتوو زەینەبی تەڵاق دا پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر فەرمانی خوای پەروەردگار و بێ گوێدانە قسەی خەڵکانی بەد و دووڕوو، داوای خاتوو زەینەبی کرد، بەڵام ئەمجارەیان خۆی قسەی لەگەڵ خاتوو زەینەب نەکرد، بەڵکو زەیدی هاوسەری پێشووی ڕاسپارد کە ئەو بچێت و بۆی داوا بکات، زەیدیش بەخۆشحاڵییەوە چوو داوای خاتوو زەینەبی بۆ پێغەمبەر ﷺ کرد، زەید خۆی دەگێڕێتەوە و لەو بارەیەوە دەفەرموێت: کە چووم بۆ ئەوەی خوازبێنی بکەم، خەریك بوو هەویری دەشێلا، کە چاوم پێی کەوت بیرم کردەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ داوای دەکات و دەبێتە خێزانی ئەو، ئەوەندە گەورە بوو لەلام نەمتوانی سەیری بکەم و گەڕامەوە دواوە و پشتم تێکرد و پاشان پێم وت: زەینەب پێغەمبەری خودا ﷺ منی ناردووە و داوای هاوسەرییت لێ دەکات، ئەویش لە وەڵامدا وتی: من هیچ بڕیارێك نادەم، هەتا مۆڵەت و فەرمانی خوای لەسەر نەبێت –مەبەستی ئەوە بوو کە تا نوێژی ئیستخارەی بۆ نەکات– پاشان هەستا و نوێژی کرد و دواتر ڕەزامەندیی نواند لەسەر ئەوەی هاوسەرگیریی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بکات.

- لە مانگی ذوالقعدةی ساڵی پێنجی کۆچی خاتوو زەینەب ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ دەستپێکرد.

– خاتوو زەینەب یەکێك بووە لەو ئافرەتانەی کە زیاد لەوەی خوای پەروەردگار بۆ هاوسەری پێغەمبەرەکەی ﷺ هەڵیبژاردووە، میهر و بەخششی زۆری تری لەگەڵ کردبوو لەوانە:

أ- خوای پەروەردگار لە سەروو حەوت ئاسمانەوە شایەتی باوەڕداری بۆ داوە، لەو ئایەتەی کە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى اللَّهُ وَرَسُولُهُ أَمْراً

أَنْ يَكُونَ لَهُمُ الْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾[٢٦]. مەبەست لە ﴿مُؤْمِنٍ﴾ وَ ﴿مُؤْمِنَةٍ﴾ لەم ئایەتەدا وەکو زانایان و راڤەکارانی قورئان دەفەرموون عەبدوڵڵای کوڕی جەحش و خاتوو زەینەبی خوشکی بووە[٢٧].

ب ـ پێغەمبەری خودا ﷺ شایەتی میهرەبانی و بەخشندەیی بۆ داوە، لەو بارەیەوە خاتوو عائیشە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ بە خێزانەکانی دەفەرموو: {أَسْرَعُكُنَّ لَحَاقًا بِي أَطْوَلُكُنَّ يَدًا}[٢٨]. واتە: کامەتان لە هەمووتان دەستی درێژتر بێت، ئەوە لە دوای کۆچی دوایی من لە هەمووتان زووتر بە من دەگات، جا خاتوو عائیشە دەفەرموێت: لە دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر ﷺ کاتێك کە لەگەڵ خێزانەکانی تری پێغەمبەر ﷺ کۆ دەبوینەوە، هەموومان دەستمان رووەو دیوارەکە درێژ دەکرد و بە دارێك دەمانپێوا، تا بزانین کاممان لە هەموومان دەستی درێژترە، چونکە واماندەزانی مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ لەو فەرموودەیە درێژی دەستەکانی لاشەمانە، خاتوو سەودە دەستی لە هەموومان درێژتر بوو، تا خاتوو زەینەب بەر لە هەموومان کۆچی دوایی کرد، ئەوجا زانیمان کە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ لە درێژی دەست، بەخشندەیی و خێر و چاکە بوو، نەك درێژیی دەستەکانی لاشەمان، لەبەر ئەوەی خاتوو زەینەب لەو رووەوە دەستەکانی کورت بوون، بەڵام ئەو لە هەموومان بەخشندەتر بوو، بە دەستەکانی

---

٢٦ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٦.

٢٧ - الطبري (محمد بن جرير بن يزيد)- تفسير الطبري (جامع البيان في تأويل القرآن)- ج٢٠/ص٢٧١- مؤسسة الرسالة/ بيروت- ط١/ ١٤٢٠- تحقيق: أحمد محمد شاكر. إبن كثير (أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير)- تفسير القرآن العظيم- ج٦/ص٤٢١- دار طيبة/ -ط٢/ ١٤٢٠- تحقيق: سامي بن محمد سلامة.

٢٨ - البخاري- صحيح البخاري- ج٢/ص٥١٥- كتاب (٣٠) الزكاة/ باب (١٠) أي الصدقة أفضل وصدقة الشحيح الصحيح- الحديث (١٣٥٤). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص١٤٤- كتاب (٤٥) فضائل الصحابة/ باب (١٧) من فضائل زينب أم المؤمنين رضي الله عنها- الحديث (٦٤٧٠).

خۆی کاری دەکرد و پێستەی خۆش دەکرد و شتی دەچنی و پاشان پارەکەی لە ڕێگەی خودادا دەبەخشی.

ت.ـ بە شایەتی خاتوو عائیشەیش خاتوو زەینەب باشترینی کەس بووە لە نێوان ئەو خێزانانەی پێغەمبەر ﷺ کە ئەو لەگەڵیان ژیاوە و لەم بارەیەوە دەفەرموێت: لە نێوان خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ تەنیا خاتوو زەینەب هاوشانی من بوو، هەمان ڕێز و پێگەی منی هەبوو لەلای پێغەمبەری خودا ﷺ، هیچ ئافرەتێکی ترم نەبینیوە کە لەو دیندارتر، ڕاستگۆتر، بەخشندەتر و خزمدۆستتر بێت.

پ ـ خوای پەروەردگار بە فەرمانی خۆی و لە قورئاندا، فەرمانی بە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد کە دەبێت خاتوو زەینەب بکاتە هاوسەری خۆی، هەر خۆیشی لە ئاسمانەوە بە شایەتی جبریل و سەرجەم فریشتەکان لە پێغەمبەری خودای ﷺ مارە کرد، خاتوو زەینەب لەسەر زەوی مارە نەکراوە لە پێغەمبەر ﷺ و خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا﴾[٢٩].
واتە: کاتێك زەید دەستی لە زەینەب هەڵگرت و پەیوەندییان کۆتایی هات لە تۆمان مارە کرد و کردمانە هاوسەری تۆ.

هەر بۆیە خاتوو زەینەب زۆر شانازیی بەوەوە دەکرد لە ناو خێزانەکانی تری پێغەمبەردا ﷺ و هەمیشە پێی دەوتن: ئێوە باوك و برا و کەس و کارتان داونی بە پێغەمبەر ﷺ و لێی مارە کردوون، بەڵام من خوای گەورە لە سەروو حەوت ئاسمانەوە داومی بە پێغەمبەر ﷺ و لێی مارە کردووم، جگە لە خاتوو زەینەب خوای گەورە ئەم بەخششەی لەگەڵ هیچ ئافرەتێکی تر نەکردووە.

ج ـ یەکەم کەس بووە لە خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ کە پاش وەفاتی پێغەمبەر ﷺ کۆچی دوایی کردووە.

---

٢٩ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٧.

ح ـ پێغەمبەری خودا ﷺ لە ئاهەنگی گواستنەوەکەیدا مەڕێکی سەر بڕیوە، لە گواستنەوەی هیچ خێزانێکی تریدا مەڕی سەرنەبڕیوە.

ـ لە ساڵی بیستی کۆچی و لە تەمەنی پەنجا و سێ ساڵیدا و لە سەردەمی جێنشینی ئیمامی عومەر (ڕەزای خوای لێبێت) خاتوو زەینەب کۆچی دوایی کردووە، پاش خۆی هیچ شتێکی وەك میراتی جێ نەهێشتووە، ئیمامی عومەر خۆی بە ئامادە بوونی خەڵکێکی زۆر نوێژی مردووی لەسەر خوێندووە و تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە.

ـ خاتوو زەینەب لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ یازدە فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە و بوخاری و موسلیم لە سەر گێڕانەوەی دوان لەو فەرموودانە کۆك بوون.

ـ ئامانجی سەرەکی لەم هاوسەرگیرییەی پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو زەینەب ئەوە بووە کە خوای پەروەردگار ویستویەتی بە شێوەیەکی کرداری و لەسەر دەستی پێغەمبەرەکەی ﷺ بە تەواوەتی یاسا و دابونەریتی بەکوڕکردن و شوێنەوارەکانی لە دڵ و دەروونی موسڵماناندا هەڵبووەشێنێتەوە و بسڕێتەوە، چونکە پێشتر موسڵمانانی لەوە ئاگادار کردبووەوە کە یاسای بەکوڕکردن کارێکی ناشیاوە و یاساغە، ئەو منداڵانەی کە خەڵکێك کردونیان بە کوڕی خۆیان دەبێت بە ناوی باوکی ڕاستیی خۆیانەوە بانگ بکرێن و چەند ئایەتێکی لەم بارەیەوە ناردە خوارەوە و تێیدا فەرموی: ﴿وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءكُمْ أَبْنَاءكُمْ ذَلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ وَاللَّهُ يَقُولُ الْحَقَّ وَهُوَ يَهْدِي السَّبِيلَ ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ وَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ فِيمَا أَخْطَأْتُم بِهِ وَلَكِن مَّا تَعَمَّدَتْ قُلُوبُكُمْ وَكَانَ اللَّهُ غَفُوراً رَّحِيماً﴾[٣٠]. کەواتە ئامانجی سەرەکی ئەم هاوسەرگیرییە بریتی بوو لە هەڵوەشاندنەوەی دابونەریتێکی کۆمەڵایەتی سەردەمی

---

٣٠ - سورة الأحزاب: الآية ٤-٥.

نەفامی، خوای گەورەیش بە راشکاوی باسی لە ئامانجی ئەم هاوسەرگیرییە کردووە و فەرمویەتی: ﴿لِكَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ﴾[٣١]. واتـە: بۆیـە خـاتوو زەینـەبمان کـردە هاوسـەری تـۆ، تـا بـاوەڕداران هـیچ دوودڵـی و گومانێکیان نـەمێنێت لـە مارەکردنـەوەی خێزانـی ئـەو منداڵانـەی کـە کردوویاننەتـە کوڕی خۆیان.

ـ ئێمـە وەکـو پێـشتریش باسمـان کـرد بەڵگـەکانی قورئـان، فـەرموودەکانی پێغەمبـەر ﷺ، قـسەی هـاوەڵان و گێڕانـەوە مێژوییـە راسـت و دروسـتەکان، پشتڕاستی ئەوە دەکەنەوە کە هەموو هەنگاوێك لە هەنگاوەکانی ئەم هاوسەرگیرییە فەرمان و ویستی خوای لەسـەر بـووە و بـەهیچ شـێوەیەك حـەز و ئـارەزوو ویـستی پێغەمبـەری ﷺ تێـدا رەچـاو نـەکراوە، بـەڵام ناحـەزانی ئیـسلام وەك پیـشەی هەمیشەیی خۆیان لە کۆن و نوێدا کۆمـەڵێك قـسەی بێبنـەما و دوور لـە راسـتییان هەڵبەستووە، لەم بارەیەوە کە وەك تانە و رەخنە دژ بـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ و مێژووی پاکی ئایینی پیرۆزی ئیـسلام بـەکاری دەهێـنن، زۆر بەداخـەوە زۆرێـك لـەو قسە بێبنەما و هەڵبەستراوانە دزەیان کردووەتە ناو کۆمەڵێك سەرچاوەی رەسـەنی ئیسلامییەوە و لە پەڕتووکەکانی راڤەکردنی قورئان و فەرموودە و مێـژوو و... هتـد، بەرچاوی خوێنەر دەکەون، خاوەنی ئەو سەرچاوانەش ئەو قـسانەیان گێڕاوەتـەوە، بەبێ ئەوەی خوێنەر ئاگادار بکەنـەوە لـە سـەر دروسـتی، یـان هەڵبەسـتراوی ئـەو قسانە، خەڵکانێکی زۆریش بەهۆی ئەوەوە بەهەڵەدا چوون.

هـەموو ئـەو قـسانەیش لەگـەڵ زۆریـی و بۆرییانـدا جـەخت لـە سـەر دوو خـاڵ دەکەنەوە:

یەکەم: لە رووی چۆنێتیەوە ناحەزان و بێباوەڕان زۆر باسـی ئـەوە دەکـەن کـە گوایە هاوسەرگیریی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ خاتوو زەینەب لە سەر حەز و ئـارەزوو و

---

٣١ - سورة الأحزاب: الآية ٣٧.

خواستی پێغەمبەر بووە ﷺ، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ رۆژێک لە رۆژان دەچێتە ماڵی زەید و لەوێ چاوی بە خاتوو زەینەب دەکەوێت، کە جلێکی تەنکی لەبەردا دەبێت، ئیتر لەو کاتەوە پێغەمبەری خودا ﷺ خولیای خاتوو زەینەب دەبێت، زەیدیش کە بەمە دەزانێت لەبەر پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو زەینەب تەڵاق دەدات.

**دووەم:** لە رووی چەندێتیشەوە ناحەزان قسە لەسەر ئەوە دەکەن کە بە پێی رێنماییەکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام پیاو بۆی هەیە تەنیا چوار ژن بهێنێت، بەڵام خاتوو زەینەب خێزانی پێنجەمی پێغەمبەر بووە ﷺ و پاش خاتوو زەینەبیش پێغەمبەری خودا ﷺ چەندین خێزانی تری هێناوە، جا چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم کارەی بۆ خۆی بە دروست زانیوە، بەڵام لە خەڵکی تری یاساغ و حەرام کردووە ؟.

ـ ئێمە لێرەدا بۆ روونکردنەوەی راستییەکان و رەواندنەوەی ئەو جۆرە گومانانە، سەرەتا لە سەر چۆنێتی رووداني ئەم هاوسەرگیرییە چەند خاڵێک دەخەینە روو:

أـ ئێمەی باوەڕدار یەکەمین سەرچاوە کە پشتی پێ دەبەستین، بۆ وەڵامدانەوەی هەر پرسیارێك، یان چارەسەرکردنی هەر کێشەیەك، یان رەواندنەوەی هەرگومانێك، بریتییە لە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی خوای گەورە، لێرەیشدا یەکەمین سەرچاوە کە پشتی پێ ببەستین بۆ وەڵامدانەوەی ئەو گومانانە قورئانی پیرۆزە، بۆیە دەچینە خزمەت قورئانی پیرۆز بزانین چۆن باسی ئەم هاوسەرگیرییەمان بۆ دەکات، بەر لەوەی بچینە سەر باسەکەیشمان سەرەتا پێویستە ئاماژە بەوە بدەین کە خوای پەروەردگار چیرۆکی هیچ هاوسەرگیرییەکی پێغەمبەری ﷺ لە قورئاندا باس نەکردووە و تۆمار نەکردووە، جگە لە چیرۆکی هاوسەرگیریی خاتوو زەینەب نەبێت، کە گشت وردەکارییەکانی تۆمار کردووە، دیارە خوای پەروەردگار باشی زانیوە کە دووپوو و بێباوەڕان لەسەر ئەم

هاوسەرگیرییە بێدەنگ نابن و وەکو پیشەی هەمیشەییان قسە و قسەڵۆکی خۆیان هەڵدەبەستن، بۆیە خوای پەروەردگار بە وردی لە سورەتی ئەحزابدا چیرۆکەکە باس دەکات، جێبەجێکردنی هاوسەرگیرییەکە دەداتە پاڵ خۆی نەك پێغەمبەر ﷺ و دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَى زَيْدٌ مِنْهَا وَطَراً زَوَّجْنَاكَهَا﴾[٣٢]. واتە: کاتێك زەید دەستی لە زەینەب هەڵگرت و پەیوەندییان کۆتایی هات لە تۆمان مارە کرد و کردمانە هاوسەری تۆ، کەواتە هاوسەرگیرییەکە پەروەردگار کردوویەتی و ئەو لە ئاسمانەوە مارەی کردووە نەك پێغەمبەر ﷺ خۆی ئەم کارەی کردبێت.

پاشتریش خوای گەورە زۆر بە روونی ئاماژە بە هۆکاری سەرەکی ئەم هاوسەرگیرییە دەکات و دەفەرموێت: ﴿ كَيْ لا يَكُونَ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِي أَزْوَاجِ أَدْعِيَائِهِمْ إِذَا قَضَوْا مِنْهُنَّ وَطَراً﴾[٣٣]. واتە: بۆیە خاتوو زەینەبمان کردە هاوسەری تۆ، تا باوەڕداران هیچ دوودڵی و گومانێکیان نەمێنێت لە مارەکردنەوەی خێزانی ئەو منداڵانەی کە کردوویاننەتە کوڕی خۆیان، کەواتە ئەمە هۆکاری هاوسەرگیرییەکەیە، نەك هیچ شتێکی تر.

هەروەها قورئان ئاماژە بەوەیش دەکات کە پێغەمبەری خودا ﷺ وەکو حەز و خواستی خۆی هیچ کات حەزی بەم کارە نەبووە و بگرە جێبەجێکردنی ئەم کارەی زۆر بەلاوە قورس بووە و نەیویستوە رووبەڕووی ببێتەوە، بۆیە سەرەڕای ئەوەیش کە سوور دەیزانی و جبریل ئاگاداری کردبووەوە کە زەید زەینەب هەر تەڵاق دەدات و پاشتر دەبێت خۆی بیخوازێت، بەڵام ئەمەی باس نەدەکرد و نەیدەگوت، لە ترسی قسەی خەڵکی، تا سەرئەنجام کار گەیشتە ئەوەی کە قورئان راشکاوانە گلەیی لە هەڵوێستی پێغەمبەر ﷺ بکات و بفەرموێت: ﴿وَتُخْفِي فِي

---

٣٢ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٧.

٣٣ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٧.

﴿نَفسكَ مَا اللّهُ مُبْدِيه وتَخْشَى النَّاسَ واللّهُ أحَقُّ أنْ تَخْشَاهُ﴾[٣٤]. واته: شتێك له ناخی خۆتدا دەشاریتەوە و پەنهانی دەكەیت كه خوا دەیەوێت ئاشكرای بكات، له قسەی خەڵكی دەترسیت، له كاتێكدا خوا زیاتر شایەنی ئەوەیە كه تۆ لێی بترسیت.

پاشتر خوای پەروەردگار ئەوە دووپات دەكاتەوە كه ئەگەر ویستی كارێك بكات ئەوە حیساب بۆ ویستی هیچ كەسێك ناكات با ئەو كەسە پێغەمبەرییش بێت ﷺ، بۆیە له كۆتایی ئایەتەكەدا دەفەرموێت: ﴿وكَانَ أمْرُ اللَّه مَفْعُولاً﴾[٣٥]. واته: هەر كارێك فەرمانی خوای لەسەر بێت هەر دەبێت ببێت.

لە كۆتاییشدا خوای پەروەردگار وەك دڵنەواییەك بۆ پێغەمبەر ﷺ و بەرگرییەك لە هەڵوێستی مەردانە و جوامێرانەی لەمەڕ ئەم كێشەیەدا، وەك وەڵامدانەوەیەكیش بۆ خەڵكانی بێباوەڕ و دووڕوو دەفەرموێت: ﴿مَا كَانَ عَلَى النَّبِيِّ مِنْ حَرَجٍ فِيمَا فَرَضَ اللَّهُ لَهُ﴾[٣٦]. واته: هیچ گلەیی و گازندەیەك له پێغەمبەری خودا ﷺ ناكرێت، له ئەنجامدانی كارێكدا كه ویستی خوای لەسەر بێت و بە فەرمانی خودا ئەنجام درابێت.

هەر بۆیە ئەم ئایەتانەی قورئان زۆر بە روونی راستیی مەسەلەكان دەخەنە ڕوو، هەموو ئەو قسە و قسەڵۆكانەیش بەدرۆ دەخاتەوە كه ناحەزان هەڵیان دەبەستن و دەیانورووژێنن.

ئەگەر كەسێك باوەڕدار بێت ئەوە پێویستە باوەڕی بە ورد و درشتی قورئان و فەرموودەكانی پەروەردگار هەبێت و فەرموودەكانی پەروەردگاریش لەم بارەیەوە بەو شێوەیە بوو كه باسمان كرد، كەواتە هەر كەس جگە لەم هۆكارانە هۆكاری تر و شتی تر باس بكات جیاواز لەوەی كه خوای گەورە دەیفەرموێت دەربارەی ئەم

---

٣٤ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٧.

٣٥ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٧.

٣٦ - سورة الأحزاب: الآية: ٣٨.

هاوسەرگیرییە ئەوە باوەڕی بە خوا و راستیی فەرموودەکانی دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە.

پاشانیش ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر حەز و ئارەزووی خۆی ئەم کارەی ئەنجام بدایە، ئایا خوای گەورە لەسەر ئەم تاوان و ستەمەی پێغەمبەرەکەی ﷺ بێدەنگ دەبوو؟ ئایا ئەگەر کارێکی وا رووی بدایە خوا باسی نەدەکرد؟ ئایا هەر هیچ نەبێت گلەیی لە پێغەمبەر ﷺ نەدەکرد، کە چۆن کاری وا دەکات لە کاتێکدا لەسەر شتی زۆر لەوە بچووکتر گلەیی لێ کردووە؟

یان ئایا دەکرێت پێغەمبەری خودا ﷺ خوانەکردە کارێکی وا هەڵەی کردبێت و پاشتر خوای گەورە نەك هەر باسی هەڵەکەی نەکردبێت، بەڵکو هەڵەکەی پەردەپۆش کردبێت، زیاد لەوەش کارەکەی دابێتە پاڵ خۆی، ئایا ئەم جۆرە بیروبۆچوونانە تا چەند لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا جێی دەبێتەوە؟.

ب - پاش ئەوەی کە راستیی ئەم هاوسەرگیرییەی پێغەمبەرمان ﷺ باس کرد وەك چۆن خوای گەورە باسی کردووە، دێینە سەر باسێکی ئەو قسانەی کە بە شێوازێکی تر و بە پێچەوانەی قورئانەوە باسی هۆکارەکانی ئەم هاوسەرگیرییەمان بۆ دەکەن، کە زانایانی شارەزای فەرموودە و شەرعزان هەموو ئەو رێگە و شێوازانەیان رەت کردووەتەوە و کاریان پێ نەکردووە، لەبەر دوو هۆی سەرەکی:

**یەکەم:** لە رووی رێگەکانی گێڕانەوە (سند)یانەوە هەموو ئەو قسانە لاوازن و خەڵکانێکی بێمتمانە، یان هەر درۆزن گێڕاویانەتەوە و باسیان کردوون، بۆیە زانایان پشتیان پێ نەبەستووە و رەتیان کردووەتەوە، بۆ نموونە ئیمامی (قرطبي) لە تەفسیرەکەیدا دەفەرموێت: (ئەو قسانەی باس لەوە دەکەن کە گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ حەزی لە خاتوو زەینەب کردووە، یان لەوانەیە هەندێك خەڵکی نەفس نزم بڵێن شەیدای بووە، ئەو جۆرە قسانە یان خەڵکانێکی نەزان و

گێل دەیکەن، یان خەڵکانێك کە سووکایەتی بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەکەن)[٣٧].

(إبن كثير)یش دەربارەی ئەو قسە و باسانە دەفەرموێت: (ئیبن ئەبی حاتەم و ئیبن جەریر هەندێك قسە و باس لە پێشینی خۆیانەوە دەگێڕنەوە لەو بارەیەوە، لەبەر نادروستی و ناتەواوییان وامان پێخۆش بوو هەر باسیان نەکەین و گوێیان پێ نەدەین، ئیمامی ئەحمەدیش لەو بارەیەوە قسەیەك لە حەممادی کوڕی زەیدەوە لە سابتەوە لە ئەنەسەوە دەگێڕێتەوە، ئەویش هەر ناتەواوە و نامۆییەکی تێدایە بۆیە ئەویشمان هەر باس نەکردووە)[٣٨]. (إبن الحجر)یش پاش ئەوەی کە هەندێك لەو قسانە باس دەکات دەفەرموێت: (ناکرێت مرۆڤ خۆی بەو جۆرە قسانەوە خەریك و سەرقاڵ بکات)[٣٩].

**دووەم:** لە ڕووی دەق (متن)ەکانەوە، دەقەکان هەر یەکە و بەجۆرێك باس لەو مەسەلەیە دەکەن و خۆیان لەناو خۆیاندا جیاوازن و دژ بەیەك دەوەستنەوە، هەر بۆ نموونە هەندێکیان وا باس دەکەن کە گوایە ئەو کاتەی پێغەمبەر ﷺ چووەتە ماڵی زەید، زەید خۆی لە ماڵ نەبووە و خاتوو زەینەب هاتووە و بەخێرهاتنی کردووە، هەندێکی تر وا باسی دەکەن کە نەخێر زەید لە ماڵ بووە، بەڵام نەخۆش بووە، بۆیە خاتوو زەینەب هاتووە بەرەوپیری.

سەبارەت بە شێوازی بینینی خاتوو زەینەبیش هەندێك ریوایەت وا باس دەکەن کە گوایە خاتوو زەینەب کە زانیویەتی پێغەمبەر ﷺ لەبەردەرگایە لە پەلەپەلیدا بیری چووە خۆی پۆشتە بکات و بەو شێوەیە هاتووە دەرگای کردۆتەوە، هەندێکی تر وا باس دەکەن کە گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ لە بەر دەرگای ماڵی زەید وەستاوە و دەرگای ماڵەکەیان لە مووی بزن دروست کراوە و لەو کاتەدا بایەك

---

[٣٧] - القرطبي (أبو عبدالله محمد بن أحمد القرطبي)- تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن)- ج١٤/ص١٩١- دار إحياء التراث العربي/ بيروت.

[٣٨] - إبن كثير- تفسير القرآن العظيم- ج٣/ص٥٩٣.

[٣٩] - إبن الحجر- فتح الباري شرح صحيح البخاري- ج٨/ص٥٢٤.

هاتووه و دەرگاکەی هەڵداوەتەوە و پێغەمبەری خوداش ﷺ چاوی پەرپوەتە سەر خاتوو زەینەب، هەندێکی تریش وا باس دەکەن کە پێغەمبەری خودا ﷺ داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوەی کردووە و خاتوو زەینەبیش فەرمووی لێ کردووە و لەو کاتەدا پۆشتە نەبووە کە پێغەمبەری خودا ﷺ بینیویەتی.

جا سەرەڕای ئەوەی کە ئەو جۆرە قسانە پێچەوانەی قورئان و ئەو فەرموودە دروستانەن، کە جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە زەید خۆی کێشەی لەگەڵ خاتوو زەینەب هەبووە و هەمیشە لای پێغەمبەری خودا ﷺ سکاڵای لە دەست کردووە و ویستویەتی لێی جیا ببێتەوە، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگریی کردووە و نەیویستووە تەڵاقی بدات.

هەر بۆیە زانایان ئەو قسانە ڕەت دەکەنەوە و کاری پێناکەن، بەجۆرێك لە درۆ و هەڵبەستراو و هەڵوێستێکی دوژمنکارانە دژ بە ئاین و پێغەمبەری ئیسلام ﷺ پۆلێنیان کردووە.

ت- بەڵگەیەکی تر کە ئەو جۆرە قسە و باسانە پووچەڵ دەکاتەوە ئەوەیە کە ئێمە وەکو پێشتر باسمان کرد خاتوو زەینەب پورزای پێغەمبەر ﷺ خۆی بووە، هەر لە منداڵییەوە و بەر لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەریش ﷺ خاتوو زەینەب لە بەردەستی خۆیدا گەورە بووە، پێغەمبەری خودا ﷺ سەرپەشتکار و جێراوێژی بووە، هەرکات پێغەمبەری خودا ﷺ ویستبێتی بینیوێتی و سەردانی ماڵیانی کردووە، هەموو جوانییەکانی خاتوو زەینەبی بینیوە، بە تایبەتیش لەو کاتانەدا کە هێشتا فەرمانی باڵاپۆشی بۆ ئافرەتان دانەبەزیبوو، کەواتە: ئایا دەگونجێت پێغەمبەری خودا ﷺ لەو هەموو مێژووی تێکەڵییەی لەگەڵ خانەوادەی خاتوو زەینەب و بەدرێژایی تەمەنی لاوێتی خاتوو زەینەب و بە کچێتی، پێغەمبەری خودا ﷺ جوانییەکانی خاتوو زەینەبی نەبینیبێت، ڕۆژێك لە ڕۆژان بە دڵ و خەیاڵیدا نەهاتبێت داوای بکات، بەڵام دواتر و لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا، لەو کاتەی کە خاتوو زەینەب خێزانی کەسێکی ترە، ئەو کەسەیش پێغەمبەری خودا ﷺ بە

کوڕی خۆی ئەژماری دەکات، پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ تەنیا ساتێك چاوی بە خاتوو زەینەب بکەوێت و لەو ساتەدا شتێکی وەهای بینیبێت کە شەیدای بووبێت؟! بە ڕاستیی ئەمە زۆر دوورە لە ڕاستیی و ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەری سەروەرمانەوە ﷺ.

ت ـ ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ بیویستایە خاتوو زەینەب مارە بکات ئایا بۆ لە هەرەتی لاوێتی خاتوو زەینەب، لەو کاتانەی کە کچ بوو داوای نەدەکرد، لە کاتێکدا هیچ شتێکیش ڕێگر نەبووە لە بەردەمیدا، خاتوو زەینەب بە ئاواتی دەخواست کە پێغەمبەری خودا ﷺ داوای بکات، جا ئایا دەگونجێت کەسێك بە کچی جێی تێبینی و سەرنجی کەسێك نەبێت، بەڵام پاش ئەوەی کە شوو دەکات و دەبێتە خێزانی کەسێکی تر ئەوجا حەزی لێ بکات و بیەوێت بیخوازێت؟.

ج ـ گریمان ئەو جۆرە قسە و باسانە ڕاستن، پێغەمبەری خودایش ﷺ حەزی لە خاتوو زەینەب کردووە، بە دڵنیاییەوە ئەمە دەبێت وەکو تاوان سەیری بکرێت و هەوڵ بدرێت کە پەردەپۆش بکرێت و پێغەمبەری خودایش ﷺ تەوبە لەو حەزەی خۆی بکات، بەڵام بە پێچەوانەوە دەبینین خوای پەروەردگار لە قورئاندا فەرمان بە ئاشکرا کردن و ڕاگەیاندنی فەرمانی خۆی و هەڵوێستی پێغەمبەرەکەی ﷺ دەکات، هەڵی دەنێت بۆ ئەوەی هیچ شەرم نەکات و تەنیا لە خوای پەروەردگار بترسێت، جا ئەگەر ئەو هەڵوێستە تاوانکارانە بوو چۆن پەروەردگار فەرمان بە ئاشکراکردنی ئەو تاوانە دەکات، کە ئەنجامدەرەکەی پێغەمبەرەکەیەتی، یان چۆن هەڵی دەنێت کە لە ئەنجامدانی ئەو هەڵوێستە تاوانکارییەی تەنیا لە خوا بترسێت؟ لە کاتێکدا مرۆڤ لە ئەنجامدانی کاری چاکەدا هەڵدەنرێت کە تەنیا لە خوا بترسێت، نەك لە کاری تاوانکارییدا، چونکە ئەوە وەك ئەوە وایە کەسێك خەریکی ئەنجامدانی تاوانێك بێت تۆیش پێی بڵێیت: کاری خۆت بکە و تەنیا لە خوا نەبێت لە کەس نەترسیت، بەڵکو دەبێت پێی بوترێت: لەخوا بترسە و کاری وا ئەنجام نەدەیت، ئەویش ئەگەر لە خوا بترسێت دەبێت دەستبەرداری کارەکەی بێت، بەڵام

سەرەنجامی چیرۆکی ئەو هاوسەرگیرییە بە پێچەوانە بوو، سەرەنجام خاتوو زەینەب لەسەر فەرمانی خودا بووە خێزانی پێغەمبەر ﷺ.

ح ـ ئەگەر ئەم جۆرە قسانە راست بن ئایا چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ قبولّی کرد کە لەبەر حەزی خۆی سەر لە خەڵکێکی تر تێك بدات؟ ئەگەر گریمان ئەویش قبولّی ئەوەی کرد ئایا زەید ئەوەی چۆن لە پێغەمبەری خودا ﷺ قبولّ کرد کە حەز لە خێزانەکەی بکات؟ نەك هەر ئەوەندە بەڵکو بڕوات بۆی تەلاق بدات، پاشانیش هەر خۆی بچێت بۆی داوا بکات و خوازبێنیشی بۆ بکات؟!.

ئەم جۆرە پرسیارانە و چەندین پرسیاری تری بێوەلام لەم بارەیەوە ئەو جۆرە قسە و باسانە رەت دەکەنەوەو بە درۆیان دەخەنەوە، ئەمە لە رووی چۆنێتی ئەنجامدانی ئەو هاوسەرگیرییەوە.

**خاڵی دووەم:** کە ناحەزان قسەی لەسەر دەکەن لە رووی چەندێتییەوەیە، کە بە پێی رێنماییەکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام پیاو بۆی هەیە تەنیا چوار ژن بهێنێت، بەلام خاتوو زەینەب خێزانی پێنجەمی پێغەمبەر بووە ﷺ، پاش خاتوو زەینەبیش پێغەمبەری خودا ﷺ چەندین خێزانی تری هێناوە. چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم کارەی بۆ خۆی بە دروست زانیوە، بەلام لە خەڵکی تری یاساغ کردووە؟.

بۆ روونکردنەوەی ئەم جۆرە گومانەش دەڵێین: راستە پێغەمبەری خودا ﷺ لە رووی دروستکردنەوە وەکو ئێمە مرۆڤێکی سادە بووە، لە رووکەشدا بەهەمان شێوە و لە هەمان کەرەسە و کانزای ئێمە دروست بووە، بەلام لە رووی کەسایەتی و ئەرك و بەرنامەی ژیانەوە، کەسایەتی و ئەرك و بەرنامەی ژیانی ئەو شێوازێکی تایبەتمەندانەی هەبووە لە گشت رووەیەکەوە، نەك تەنیا لە سەردەمی پێغەمبەرایەتیدا، بەڵکو بەر لەوەیش کە هەر بێتە ژیانی دونیایش، ئەم تایبەتمەندێتیانەیش دەستی پێغەمبەری ﷺ تێدا نەبووە و خۆیشی هەڵی

نەبژاردووە و بەرنامەڕێژیی بۆ نەکردووە، بەڵکو ویستی خوای پـەروەردگار وا بـووە و ئـەو ئـەو قەدەرانـەی بـەو شـێوەیە هێناوەتـە پـێش، بـۆ مەبەسـتێك کـە خـۆی ویستویەتی، هەر وەك چۆن خوای پەروەردگار بە موسا دەفـەرموێت: ﴿وَاصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي﴾[40]. واتە: بەتایبەت تۆم بۆ خۆم دروست کـردووە، پێغەمبـەری خۆیـشمان ﷺ هەر بەو شێوەیە بووە.

مەرج نییە هەموو ئەو تایبەتمەندێتییانە لە بەرژەوەندیی ئەو بووبن، بەڵکو زۆر جار لـە رووی دونیاییـەوە بـە زیـانی ئـەو شـکاونەتەوە و خواسـت و ویـستی خـۆی لەسـەر نـەبووە، بـەڵام خـوای کاربـەجێ وای ویـستوە و ئـەویش تـەنیا مـاف جێبەجێکردنی پێ دراوە.

بە تایبەتیش لە مەسەلەی هاوسەرگیریی لەگەڵ خـاتوو زەینـەب، کـە لـە رووی چـەندێتیەوە بـە پێنجـەم خێزانـی ئـەژمار دەکرێـت، کـە بـەپێی دەقـی قورئـان پێغەمبـەری خـودا ﷺ ئـەم هاوسـەرگیرییەی زۆر بـەلاوە قـورس بـوو، بـەڵام فەرمانەکـەی خـوای پـەروەردگاری لـە قـسەی خـەڵکیی پـێ لـە پێشتر بـوو، بۆیـە سەرەنجام کارەکەی جێبەجێ کرد.

هـەر بۆیـە ویـستی خـوا وابـوو کـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ لـە مەسـەلەی هاوسەرگیرێتییدا تایبەتمەندێتییەکی هەبێت، بەڵام خۆ ئەم تایبەتمەندێتییە لـە بـەر تێرکردنـی حـەز و ئارەزووەکـانی پێغەمبـەر ﷺ نـەبوون، بـەڵکو لـە بەرژەوەنـدی بانگەواز و ئایینی ئیسلامدا بـەکار هـاتووە، چـونکە ئەگـەر بـە وردی سـەیر بکـەین دەبینین هەرچی ئەو خێزانانەی تر کە هێناونی دوای چوار خێزانی یەکەمی هەمووی بێوەژن و ئافرەتی بەتەمەن و قەیرە بوون، یەك کچیشیان تێدا نەبووە، لە کاتێکدا ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم تایبەتمەندێتییەی بۆ حەز و ئارەزووی خۆی قۆرخ بکردایە، دەبوو هەموو ئەو خێزانانەی تری کچی جوان و تازەپێگەیشتوو بونایە، لە

---

[40] - سورة طه: الآية: ٤١.

کاتێکیشدا بۆی دەست دەدا، چونکە ئەو ئەوەندە ڕێز و خۆشەویستی هەبوو لە دڵی هاوەڵانیدا دەستی بخستایەتە سەر هەر کچێك بە دڵنیاییەوە ڕەت نەدەکرایەوە و بگرە بە مایەی شانازیشیان دەزانی.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەو خێزانانەی هەموویان دوای تەمەنی پەنجاوپێنج ساڵی هێناوە، واتە هەشت ساڵ پێش وەفاتی خۆی، ئەگەر مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ ئارەزووبازی بوایە، ئەوە دەبوو لە هەرەتی لاوێتییدا ئەو هەموو ژنانەی بهێنایە، بەڵام ئەمانە هیچی وا نەبوون.

شتێکی تر کە جێی قسە و باس بێت لێرەدا ئەوەیە: کە پێغەمبەری خودا ﷺ تەنیا ئەم تایبەتمەندێتییەی نەبووە لە ژیاندا وەك ناحەزانی باسی لێوە دەکەن و زەقی دەکەنەوە و دەیکەنە مایەی تانە و تەشەر، بەڵکو چەندین تایبەتمەندی تری هەبووە، کە هەمووی ئەرك و بارقورسی بوون لە ڕووی دونیاییەوە، هەر کەسێکیش دادوەر بێت دەبێت کە قسە لە سەر بابەتێك دەکات، لە هەموو ڕوویەکەوە قسەی لەسەر بکات وەك چۆنە لە واقیعدا، نەك وەك ئەوەی خۆی دەیەوێت.

بۆ سەلماندن و زیاتر ڕوونکردنەوەی قسەکان و تیشك خستنە سەر ئەم لایەنەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ هەندێك لەو تایبەتمەندێتییانە دەخەینە ڕوو، بۆ نموونە:

- پێغەمبەری خودا ﷺ بۆی هەبووە کە چەند ڕۆژێك لە سەر یەك بەڕۆژوو بێت، بەبێ ئەوەی ڕۆژووەکەی بشکێنێت، کە هاوەڵەکانی ویستویانە چاوی لێ بکەن، ڕێگەی پێ نەداون و فەرموویەتی من وەك ئێوە نیم، عەبدوڵڵا کوڕی عومەر (ڕەزای خوایان لێ بێت) بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (.. {أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ نَهَى عَنِ الْوِصَالِ} فَقِيلَ لَهُ: إِنَّكَ تُوَاصِلُ. فَقَالَ: {إِنِّي لَسْتُ كَهَيْئَتِكُمْ} ..)[41].

---

٤١ - البخاري- صحيح البخاري- ج٢/ص٦٩٣- كتاب (٣٦) الصوم/ باب (٤٧) الوصال ومن قال ليس في الليل صيام- الحديث (١٨٦٢). مسلم- صحيح مسلم- ج٣/ص١٣٤- كتاب (١٤) الصيام/ باب (١١) النهي عن الوصال في الصوم- الحديث (٢٦٢٧).

- هەموو موسڵمانێك بۆی هەیە لە کاتی هەژاری و نەدارییدا پارەی زەکات و خێر لە موسڵمانان وەربگرێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ ئەو هەموو هەژاری و نەدارییەیش بۆی نەبووە بەهیچ شێوەیەك زەکات و خێر و بەخشین لە خەڵکی وەربگرێت، یان تەنانەت لێی بخوات. لەم بارەیەیشەوە دەفەرموێت: {إِنَّ هَذِهِ الصَّدَقَاتِ إِنَّمَا هِيَ أَوْسَاخُ النَّاسِ وَإِنَّهَا لاَ تَحِلُّ لِمُحَمَّدٍ وَلاَ لآلِ مُحَمَّدٍ}[٤٢].

- هەموو موسڵمانێك ئازادە لەوەی کە خێزانێکی تەڵاق بدات و خێزانێکی تر بخوازێت، یان ئەگەر خێزانێکی مرد یەکێکی تر بخوازێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ پاش ئەو خێزانانەی کە هێناویەتی خوای پەروەردگار ئاگاداری کردووەتەوە کە ئەگەر ئەو خێزانانەی تەڵاقیش بدات یان بشمرن، بەهیچ شێوەیەك بۆی نییە ژنی تر بهێنێت. خوای پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿لا يَحِلُّ لَكَ النِّسَاءُ مِنْ بَعْدُ وَلا أَنْ تَبَدَّلَ بِهِنَّ مِنْ أَزْوَاجٍ وَلَوْ أَعْجَبَكَ حُسْنُهُنَّ﴾[٤٣].

- هەر فەرمانڕەوا و کاربەدەستێك ئەگەر بڕیاری شەڕی دا ئاساییە لێی پاشگەز ببێتەوە، یان پاشەکشەی لێبکات، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ هەرکات پۆشاکی شەڕی لەبەر کردبێت بۆی نەبووە دایبکەنێت تا ئەو شەڕەی بە ئەنجام نەگەیاندبێت، ژمارەی دوژمنەکانی هەر چەند و هەر چۆن بووبن بۆی نەبووە لەبەریان هەڵبێت و پشتیان لێ هەڵبکات. لەم بارەیەوە دەفەرموێت: {إِنَّهُ لَيْسَ لِنَبِيٍّ ﷺ إِذَا لَبِسَ لأْمَتَهُ أَنْ يَضَعَهَا حَتَّى يُقَاتِلَ}[٤٤].

---

٤٢ - مسلم- صحيح مسلم- ج٣/ص١١٩- كتاب (١٣) الزكاة/ باب (٥٢) ترك إستعمال آل النبي على الصدقة- الحديث (٢٥٣١). إبن خزيمة (محمد بن إسحاق بن خزيمة)- صحيح إبن خزيمة- ج٤/ص٦٠- باب ذكر الدليل على أن الصدقة المحرمة على النبي ﷺ هي الصدقة المفروضة التي أوجبها الله في أموال الأغنياء المكتب الإسلامي/ بيروت- ط/١٣٩٠- تحقيق: د. محمد مصطفى الأعظمي- الحديث (٢٣٥٢).

٤٣ - سورة الأحزاب: الآية: ٥٢.

٤٤ - إبن الجارود- المنتقى- ص٢٦٦- باب (٢٦) ما جاء في لبس الدرع- الحديث (١٠٦١). النسائي- سنن النسائي الكبرى- ج٤/ص٣٨٩- الحديث (٧٦٤٧).

- هەر موسڵمانێك بمرێت هەرچی پارە و پوولی هەیە بۆ میراتگرەکانی خۆی دەبێت، تەنیا پێغەمبەری خودا ﷺ نەبێت کە پاش وەفاتکردنی هەرچی ماڵ و میراتییەکی جێ هێشتبێت نەدراوە بە خێزان و منداڵ و میراتگرەکانی، بەڵکو بەخشراوەتە موسڵمانان و لەم بارەیەوە فەرمویەتی: {لَا نُورَثُ مَا تَرَكْنَاهُ صَدَقَةٌ}[٤٥].

- هەموو موسڵمانێك لای کەمی مافی ئەوەی هەیە فێری خوێندەواری ببێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ مافی ئەوەی نەبووە، چونکە نەخوێندەواری ئەو یەکێك بووە لە موعجیزەکانی، خوای پەروەردگار بەوە وەسفی دەکات و دەفەرموێت: ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ النَّبِيِّ الْأُمِّيِّ الَّذِي يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَكَلِمَاتِهِ﴾[٤٦].

- هەر موسڵمانێك بە قەرزداری بمرێت ئەوە پێویستە کەس و کارەکەی قەرزەکانی بۆ بدەنەوە، بەڵام لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەگەر کەسێك بە قەرزداری مردبێت و کەسێکی وای نەبووبێت کە قەرزەکەی بۆ بداتەوە، پێغەمبەر ﷺ قەرزەکەی بۆ داوەتەوە. لەم بارەیەشەوە فەرمویەتی: {أَنَا أَوْلَى بِكُلِّ مُؤْمِنٍ مِنْ نَفْسِهِ، مَنْ تَرَكَ مَالاً فَلأَهْلِهِ، وَمَنْ تَرَكَ دَيْنًا أَوْ ضَيَاعًا فَإِلَيَّ وَعَلَيَّ}[٤٧].

- هەموو موسڵمانێك ئازادە لەوەی کە شیعر فێر ببێت یان بیڵێت، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ نە شیعری گوتووە و نە بۆیشی هەبووە فێری ببێت، خوای

---

[٤٥] - مسلم- صحيح مسلم- ج٥/ص١٥١- كتاب (٣٢) الجهاد والسير/ باب (١٥) حكم الفيء- الحديث (٤٦٧٦). إبن خزيمة- صحيح إبن خزيمة- ج٤/ص١٢٠- باب الوصية بالحبس من الضياع والأرضين- الحديث (٢٤٨٨).

[٤٦] - سورة الأعراف: الآية: ١٥٨.

[٤٧] - البخاري- صحيح البخاري- ج٢/ص٨٤٥- كتاب (٤٨) الاستقراض وأداء الديون والحجر والتفليس/ باب (١١) الصلاة على من ترك دنيا- الحديث (٢٢٦٨). إبن حبان- صحيح إبن حبان- ج٧/ص٣٣٢- الحديث (٣٠٦٣).

پەروەردگار لەم بارەیەوە دەفەرمویت: ﴿وَمَا عَلَّمْنَاهُ الشِّعْرَ وَمَا يَنْبَغِي لَهُ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ وَقُرْآنٌ مُبِينٌ﴾[48].

- هەموو کەسێك ئازار و ئێشی وەك خەڵکانی تر ئاساییە، تەنیا پێغەمبەری خودا ﷺ نەبێت، کە ئازار و ئێشی نەخۆشی دوو هێندەی ئازار و ئێشی خەڵکی تر بووە، لەم بارەیەیشەوە فەرمویەتی: {إِنِّي أُوعَكُ كَمَا يُوعَكُ رَجُلَانِ مِنْكُمْ}[49].

جا ئەگەر بە وردی سەرنجی ئەم خاڵانە بدەین بۆمان دەردەکەوێت کە زۆرێك لەو تایبەتمەندییانەی پێغەمبەر ﷺ لە بەرژەوەندیی دونیای ئەو نەبوون، بەڵام لە بەر ئەوەی کە ویستی خوای لەسەر بووە جێبەجێی کردوون و پێیانەوە پابەند بووە.

هاوسەرگیرییەکانیشی هەر دەچنە ئەم خانەیەوە و بەتایبەتیش ئەم هاوسەرگیرییەی لەگەڵ خاتوو زەینەب.

## خێزانی هەشتەم:

ـــ هەشتەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو: (رَيْحَانَةُ بِنْتُ شَمْعُون بن زَيْدٍ النَّضَرِيَّة)ی یەهودی بووە.

- خاتوو رەیحانە بەر لە پێغەمبەری خودا ﷺ خێزانی پیاوێکی یەهودی بووە لە (بَنِي قُرَيْظَةَ) بە ناوی (الحکم) و هاوسەرەکەی لە غەزای (بَنِي قُرَيْظَةَ)دا و لە ئەنجامی ئەو خیانەتە گەورەیەی کە یەهودییەکانی هۆزی (بَنِي قُرَيْظَةَ) لە شەری خەندەقدا بەرامبەر بە پێغەمبەر ﷺ و موسڵمانان کردیان دەکوژرێت.

---

[48] - سورة يس: الآية: ٦٩.

[49] - البخاري- صحيح البخاري- ج٥/ص٢١٣٩- كتاب (٧٨) المرضى/ باب (٣) أشد الناس بلاء الأنبياء ثم الأول فالأول- الحديث (٥٣٢٤). مسلم- صحيح مسلم- ج٨/ص١٤- كتاب (٤٦) البر، والصلة، والأدب/ باب (١٤) ثواب المؤمن فيما يصيبه من مرض أو حزن أو نحو ذلك حتى الشوكة يشاكها- الحديث (٦٧٢٤).

- پاش کوشتنی پیاوەکەی لە شەڕی (بَني قُرَيْظَةَ)دا خاتوو (رَيْحَانَة) بێوەژن دەکەوێت، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ داوای لێ دەکات کە موسڵمان بێت، ئەوەیشی پێ ڕادەگەیەنێت کە ئەگەر موسڵمان بێت ئەوە دەیکاتە هاوسەری خۆی، ئەویش موسڵمانبوونی خۆی ڕادەگەیەنێت و پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ ئازادی دەکات، لە مانگی موحەڕەمی ساڵی شەشی کۆچی هاوسەرگیریی لەگەڵ ئەنجام دەدات.

- هەرچەندە هەندێك لە زانایان وای بۆ دەچن کە خاتوو ڕەیحانە بە کەنیزەکی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ماوەتەوە، بەڵام بۆچوونی پەسەندی زۆرینەی زانایان ئەوەیە کە خاتوو ڕەیحانە هاوسەری بووە و کەنیزەکی نەبووە.

- خاتوو ڕەیحانە هەر لە ژیانی پێغەمبەر خۆیدا ﷺ و لە پاش گەڕانەوەی لە حەجیماڵئاوایی کۆچی دوایی دەکات و پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی نوێژی لەسەر دەکات، تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك دەسپێردرێت.

## خێزانی نۆیەم:

- نۆیەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو: (جُوَيْرِيَةُ بِنْتُ الْحَارِثِ)ی کچی (الْحَارِثِ بْنِ أَبِي ضِرَارِ بْنِ الْحَارِثِ)ی گەورەپیاوی یەهود و سەرۆکهۆزی (بَنِي الْمُصْطَلِقِ)ی یەهودی بووە.

- خاتوو جوەیریە بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ ناوی (بَرَّةَ) بووە، بەڵام بەهەمان شێوەی خاتوو زەینەب کە بووە خێزانی پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەری خودا ﷺ ناوەکەی گۆڕی بۆ جوەیریە.

- خاتوو جوەیریە بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ خێزانی کابرایەکی بێباوەڕی دڵڕەقی سەرسەخت بوو بە ناوی (مُسافع بن صَفْوان الْمُصْطَلقيّ) ئەم پیاوە زۆر دژایەتی پێغەمبەری خودای ﷺ دەکرد، تا سەرئەنجام لە شەڕی موسڵماناندا کوژرا و خاتوو جوەیریە بێوەژن کەوت.

- هۆكاری ئەو شەڕەیش كە هاوسەرەكەی خاتوو جوەیریەی تێدا كوژرا ئەوە بوو كە لە ساڵی شەشی كۆچیدا پێغەمبەری خودا ﷺ بەر گوێی كەوت كە هۆزی (بَنِي المُصْطَلِقِ) خۆیان و خەڵكانێكی تریشیان بۆ ئەوە ئامادە كردووە كە هێرش بكەنە سەر مەدینە و موسڵمانان لەناو ببەن، ئەویش بەر لەوەی ئەوان هێرشەكەیان دەست پێ بكەن و شەڕەكە بهێننە ناو مەدینەوە، دەستپێشخەری كرد و سوپایەكی ئامادە كرد و هێرشی كردە سەریان، دەستی بەسەر خۆیان و ناوچەكەیشیاندا گرت، ئیتر هۆزی (بَنِي المُصْطَلِقِ) كرانە دیل و كۆیلە -چونكە یاسای شەڕ بەر لە هاتنی ئیسلام و لەو سەردەمانەیشدا بەو شێوەیە بووە، هەتا پاشتر ئیسلام هەنگاو بە هەنگاو ئەم دیاردەیەی كۆتایی پێهێنا و بنەبڕی كرد- تەنانەت كچی سەرۆكی ئەو تیرەیەیش كە خاتوو جوەیریە بووە بە دیل گیرا و كرایە كۆیلە و درایە هاوەڵێكی ئازیزی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی (ثَابِتِ بْنِ قَيْسِ بْنِ شَمَّاسٍ). ئەو هاوەڵە ئازیزەیش مەرجی ئەوەی لەگەڵ خاتوو جوەیریە كرد كە ئەگەر بڕێك پارەی بداتێ ئەوە ئازادی دەكات.

- خاتوو جوەیریە بەو كارەساتەی كە بەسەر خۆی و هۆزەكەی هاتبوو زۆر نیگەران بوو، هانای بۆ پێغەمبەر ﷺ هێنا و سەرەتا خۆی پێ ناساند كە كچی سەرۆكی ئەو هۆزەیە و ئێستا بووەتە كۆیلە و سكاڵای لا كرد كە بەڵكو چارەیەكی بۆ بدۆزێتەوە و خۆی و هۆزەكەی لە كۆیلایەتی رزگار بكات.

- پێغەمبەری خودایش ﷺ بەدەم داواكەیەوە چوو ئەو بڕە پارەیەی كە (ثابت) دیاری كردبوو لە بەرانبەر ئازاد كردنی خاتوو جوەیریەدا، پێغەمبەری خودا ﷺ دایە (ثابت) و پاشانیش وەك زیادە رێزلێنانێك لە خاتوو جوەیریە و بە مەبەستی ئازادكردنی هۆزەكەی لە بەندی كۆیلایەتی، پێغەمبەری خودا ﷺ پێشنیازی هاوسەرگیریی بۆ خاتوو جوەیریە كرد و ئەویش زۆری پێخۆش بوو.

- لە مانگی شەعبانی ساڵی شەشی كۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ خاتوو جوەیریە پرۆسەی هاوسەرگیریی ئەنجام دا، هاوەڵەكانی پێغەمبەر ﷺ كە

بیستیان بنەماڵەی خاتوو جوەیریە بونەتە خەزوورانی پێغەمبەر ﷺ، هەموویان شەرمیان دەکرد کە ماڵە خەزوورانی پێغەمبەر ﷺ بە کۆیلە رابگرن، وەك رێزلێنانێك لە پێغەمبەر ﷺ و خاتوو جوەیریەی خێزانی، هەرچی خزم و کەس و کاری خاتوو جوەیریە هەبوو هەموویان لە کۆیلایەتی رزگار و ئازاد کرد.

- لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو جوەیریە حەوت فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

- لە مانگی رەبیعی یەکەمی ساڵی پەنجا و شەشی کۆچی و هەر لە مەدینە و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعاویەی کوڕی ئەبوسوفیان خاتوو جوەیریە لە تەمەنی شەست و پێنج ساڵییدا کۆچی دوایی کردووە، مەڕوانی کوڕی حەکەم کە ئەوکات والی مەدینە بوو بە ئامادەبوونی جەماوەرێکی زۆر لە موسڵمانان نوێژی لەسەر کرد و پاشتر تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردرا.

- هۆکاری ئەم هاوسەرگیرییەیش وەك بۆمان دەرکەوت ئەوەبوو کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە رێی ئەم هاوسەرگیریی و تێکەڵییەوە توانی بنەماڵەی خاتوو جوەیریە کە سەد خێزان دەبوون، هەموویان لە کۆتی کۆیلایەتی رزگار بکات و هەموویشیان بهێنێتە بازنەی ئیسلامەوە، هەر بۆیە خاتوو عائیشە دەربارەی خاتوو جوەیریە دەفەرموێت: (هیچ ئافرەتێکم نەبینیوە هێندەی ئەو بەسوود بووبێت بۆ هۆزەکەی)[٦٠].

---

٦٠ - إبن حبان- صحيح إبن حبان- ج٩/ص٣٦١- كتاب النكاح- الحديث (٤٠٥٤)- قال شعيب الأرنؤوط : حديث صحيح وإسناده قوي. أبو داود (أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني)- سنن أبي داود- ج٤/ص٣٤- كتاب (٣٠) العتق/ باب (٢) في بيع المكاتب إذا فسخت الكتابة- دار الفكر بيروت- الحديث (٣٩٣٣)- تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد- وقال الألباني: حديث حسن.

## خێزانی دەیەم:

- دەیەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو: (رَمْلَةُ بِنْتُ أبِي سُفْيَانَ)ی ناسراو بە (أُمّ حَبِيبَة) کچی (أبو سُفْيَان، صخر بْن حَرْب)ی دەوڵەمەند و سیاسەتمەدار و ناوداری شاری مەککە بوو، دایکیشی ناوی (صَفِيَّةُ بِنْتَ أبِي الْعَاص)ی پووری عوسمانی کوڕی عەفانی جێنیشنی سێیەمی پێغەمبەری خودا ﷺ بوو.

- حەڤدە ساڵ بەر لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ خاتوو رەملە لە شاری مەککە لە دایک بووە.

ـ لەگەڵ ئەوەیشی کە (أبو سُفْيَان)ی باوکی یەکێك بوو لە دوژمنە سەرسەختەکانی پێغەمبەر ﷺ و پەیامەکەی، بە پێچەوانەی ئەوەوە خاتوو رەملە هەر لە سەرەتاوە باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر ﷺ و راستیی پەیامەکەی هێنا، لەو پێناوەشدا و بە مەبەستی دەرباز بوون لە ستەمی بێباوەڕانی مەککە لەگەڵ هاوسەرەکەی (عُبَيْدُ اللّه بْنُ جَحْشٍ الْأسَدِيّ) کۆچیان کردووە بۆ حەبەشە، لەوێ خوای گەورە کچێکی پێ بەخشین و ناویان نا (حَبِيبَة)، ئیتر خاتوو رەملە نازناوی (أُمّ حَبِيبَة)ی هەڵگرتووە.

- پاش ماوەیەك لە گەیشتنیان بە خاکی حەبەشە هاوسەرەکەی کە برای خاتوو زەینەبی خێزانی پێغەمبەر بوو ﷺ، لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، چووەتە سەر ئایینی مەسیحیەت، بەڵام خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) چۆن پێشتر لە پێناوی خوادا دەستی لە باوك و دایك و برا و هەموو کەس و کاری هەڵگرتبوو، لەم قۆناغەشدا و هەر لەبەر خودا و لە پێناو ئایینەکەیدا دەستبەرداری هاوسەرەکەیشی بووە و لێی جیا بووەتەوە و لەوێ بێوەژن و بێکەس کەوتووە.

- پاش بێوەژنکەوتنی، خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) کەوتووەتە نارەحەتیەکی زۆرەوە، لەبەر ئایینەکەی و لە ترسی ستەمی بێباوەڕان نەیتوانیوە بگەڕێتەوە مەککە، لەم لایشەوە بە کچێکەوە بێکەس کەوتەوە، جگە لە خودا و ئەو کۆمەڵە موسڵمانە پەنابەرەی حەبەشە کەسێك، یان سەرپەرشتیارێك شك نابات، لەو کاتانەدا خودای

میهرەبان دەرگای رەحمی خۆی بە رووی خاتوو (أُمّ حَبِيبَة)دا والآ کرد، پێغەمبەری خودا ﷺ وەك وەفادارییەك و رێزلێنانێك لەو هەموو قوربانی و بەرخودانەی خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) کە لە پێناو ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا دابووی، پێغەمبەری خودا ﷺ بە (عَمْرو بْنَ أُمَيَّة الضَّمْرِيّ)دا وەلآمی ناردووە بۆ (نَّجَاشِيٍّ) پادشای حەبەشە و داوای لێ کردووە کە خوازبێنی خاتوو (أُمّ حَبِيبَة)ی بۆ بکات، ئەویش داواکەی پێغەمبەر ﷺ بە خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) راگەیاندووە.

ـ خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) کە ئەم هەواڵەی بیستووە زۆری پێ خۆش بووە و رازی بووە، (خَالدُ بْنُ سَعيد بْنِ الْعَاص)ی ئامۆزای باوکی راسپاردووە کە لە بری ئەو مارەی بکات لە پێغەمبەری ﷺ، (نَّجَاشِيٌّ)ش لەلای خۆیەوە و لە بری پێغەمبەری خودا ﷺ چوار سەد دیناری ئاڵتوونی ئەو کاتەی وەك مارەیی داوەتە خاتوو (أُمّ حَبِيبَة)، کە هیچ خێزانێکی پێغەمبەر ﷺ ئەو برە مارەییەی پێ نەدراوە.

ـ لە ساڵی حەوتی کۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو (أُمّ حَبِيبَة)دا ئەنجام داوە.

ـــ (أبو سُفْيَان)ی باوکی خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) سەرەرای ئەو هەموو دژایەتیکردنەیشی بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ، کە بیستی پێغەمبەری خودا ﷺ کچەکەی خواستووە، بەم خزمایەتی و هاوسەرگیرییە زۆر دڵخۆش بوو، لە وەسفی پێغەمبەردا ﷺ وتویەتی: (هو الفحل لا يقرع أنفه). واتە: ئەوە پیاوێکە نە کەس هاوشانێتی وە نەکەسیش دەتوانێت دەست بە روویەوە بنێت و بەرەنگاری بووەستێتەوە.

ـ جگە لەو هەڵوێستانەی کە باسمان کرد، خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) خاوەنی زۆر هەڵوێستی باوەڕدارانە و جوامێرانە و ناوازەتر بووە کە نیشانەی باوەڕ پتەویی و دڵسۆزی ئەم خاتوونە بوون بەرامبەر بە پێغەمبەری خودا ﷺ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام، لەوانە جارێکیان باوکی روو دەکاتە مەدینە، بە مەبەستی پاکانەکردن بۆ ئەو ناپاکی و سنوورشکێنییەی کە بێباوەڕانی مەککە دژ بە موسڵمانان و

پەیماننامەی حودەیبیە ئەنجامیان دابوو، بە هێرشکردن و کوشت و بڕ کردنیان بۆ هۆزی خوزاعەی هاوپەیمانی پێغەمبەر ﷺ، پاش هەوڵێکی زۆر کەس بە دەم داواکەیەوە نەچوو، کەسیش ئامادە نەبوو لەگەڵی بچێتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و تکای بۆ بکات، پاشتر رووی کردە ماڵی خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) کچی، بە هیوای ئەوەی کە بەڵکو ئەو تکایەکی لە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ بکات.

- خاتوو (أُمّ حَبِيبَة)یش پاش ئەو هەموو لێکدابڕانە کە چەند ساڵە باوکی نەبینیوە، کاتێك باوکی دێتە ژوورەوە، ئەو راخەرەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەری دانیشتووە هەڵیگرتووە و نەیهێشتووە باوکی لەسەری دابنیشێت، باوکی کە ئەم هەڵوێستەی بینیوە پێی سەیر بووە، وتویەتی: ئەوە من بە شایەنی ئەوە نازانی کە لەسەر ئەو راخەرە دابنیشم؟ یان ئەو راخەرە بە شایەنی من نابینیت؟ ئەویش لە وەڵامدا وتویەتی: نەخێر تۆ بە شایەنی ئەوە نابینم کە لە سەر ئەو راخەرە دابنیشیت، چونکە ئەوە راخەری پێغەمبەرە ﷺ و تۆیش کابرایەکی بێباوەڕی پیسیت، شایەنی ئەوە نیت لەسەر راخەری پێغەمبەری خودا ﷺ دابنیشیت.

- لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) شەست و پێنج فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

- خاتوو (أُمّ حَبِيبَة) لە تەمەنی حەفتا و چوار ساڵییدا و لە شاری مەدینە و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعاویەی برایدا کۆچی دوایی کردووە، تەرمی پیرۆزی هەر لەوێ و لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە.

## خێزانی یازدەیەم:

- یازدەیەم خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو: (صَفِيَّةَ بِنْتِ حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ)ی کچی (حُيَيِّ بْنِ أَخْطَبَ)ی گەورەپیاو و دەسەڵاتداری هۆزی (بَنِي النَّضِيرِ)ی یەهودیە، دایکیشی ناوی (بُرَّةَ بِنْتَ سَمَوْأَل)ە.

- نەسەبی خاتوو صەفیە دەگەڕێتەوە سەر پێغەمبەر (هارون بن عمران)ی برای پێغەمبەر (موسا) صەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێت.

- بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو صەفیە دوو شووی تری کردووە، یەکەمیان بە (سَلَامِ بْـنِ مُـشْكِم) و پاش ماوەیەك ئەو تەڵاقی داوە، دووەمیشیان بە (كِنَانَةُ بْنِ الرَّبِيعِ بْنِ أَبِي الْحَقِيقِ) و ئەویش لە غەزای خەیبەردا بە دەستی موسڵمانان کوژراوە.

- پاش ئەوەی کە یەهودییەکان هەر بەردەوام بوون لە سەر ئاژاوەگێڕیی خۆیان و هەوڵدان بۆ لەناو بردنی موسڵمانان، پێغەمبەری خودا ﷺ سوپایەکی ئامادە کردووە و هێرشی کردووەتە سەر ئەو قەڵا و مۆڵگانەی یەهودییەکان کە مەڵبەندی ئاشووب و فیتنەگێڕیی بوون دژ بە موسڵمانان، لە غەزایەکدا کە بەناوبانگە بە غەزای خەیبەر، لووتی یەهودییەکانی بۆ دواجار شکاندووە، هەندێك لە سەرانی فیتنە و ئاژاوەگێڕی لەو غەزایەدا لەناو بردووە، لە نێوان ئەو سەرانەدا باوك و برایەك و هاوسەرەکەی خاتوو صەفیەیان تێدا بووە، خاتوو صەفیەیش پاش کۆتایی شەڕەکە یەخسیر کراوە.

- خاتوو صەفیە بە کۆیلایەتی کەوتۆتە لای هاوەڵێکی ئازیزی پێغەمبەر ﷺ بە ناوی (دِحْيَةُ الكَلْبِيِّ)، پاشتر کابرایەك هاتووەتە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و پێی گوتووە، کە ئەو ئافرەتە هەم کچی سەرۆکهۆز و هەم خێزانی سەرۆکهۆزی دوو بنەماڵەی یەهودییە، باشتر وایە وەك دڵدانەوەیەك و ڕێزلێنانێك خەمێکی لێ بخۆیت، پێغەمبەری خودایش ﷺ بە گوێی کابرای کردووە و خاتوو صەفیەی لە کۆتی کۆیلایەتی ڕزگار کردووە و سەرپشکی کردووە لەوەی کە ئازادی بکات و لەسەر یەهودییەتی خۆی بمێنێتەوەو بگەڕێتەوە ناو کەس و کاری خۆی، یان موسڵمان بێت و لە لای موسڵمانان بمێنێتەوە، ئەویش کە ئەو ڕێزەی پێغەمبەری ﷺ بینیوە بڕیاری موسڵمان بوونی داوە و پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ وەك زیادە ڕێزلێنانێك خواستویەتی و ئەویش زۆری پێخۆش بووە.

ـ لە مانگی شەووالی ساڵی حەوتی کۆچی پێغەمبەری خودا ﷺ ژیانی هاوسەری لەگەڵ خاتوو صەفیەدا دەست پێکردووە.

ـ پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر رێزی خاتوو صەفیەی گرتووە، جارێکیان خاتوو صەفیە چاو بەگریان هاتۆتە خزمەتی و ئەویش لێی پرسیوە بۆ دەگریت؟ خاتوو صەفیەیش لەوەڵامدا وتویەتی: خاتوو حەفصە پێم دەڵێ کچە یەهودی، پێغەمبەری خودایش ﷺ پێی فەرمووە: {إِنَّكِ ابْنَةُ نَبِيٍ ﷺ، وَإِنَّ عَمَّكِ لَنَبِيٌّ، وَإِنَّكِ تَحْتَ نَبِيٍ ﷺ، فَبِمَ تَفْخَرُ عَلَيْكِ؟، ثُمَّ قَالَ: اتَّقِي اللَّهَ يَا حَفْصَةُ}[٥١]. واتە: تۆ کچی پێغەمبەریت، مامیشت پێغەمبەرە –مەبەستی هاروون و موسای برایەتی– خێزانی پێغەمبەریشیت، ئیتر حەفصە بە چی نازت بەسەردا دەکات، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ بە خاتوو حەفصەی گوتووە: لە خوا بترسە و وای پێ مەڵێ.

ـ خاتوو صەفیە لە ژیانی خۆیدا خاوەنی زۆر هەڵوێستی جوامێرانە بووە لە زۆر کات و شوێندا، لەوانە کاتێك ئاژاوەگێڕ و چەتەکان گەمارۆی ماڵی خەلیفەی ستەملێکراو (عُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ)یان داوەو ویستویانە بە ناحەق شەهیدی بکەن، هەموو رێگەیەکی خواردن و خواردنەوەیان لە خۆی و خانەوادەکەی گرتووە، خاتوو صەفیە لەو کاتە ناسکەدا بێ گوێدانە هیچ مەترسییەك بەردەوام لە ماڵەکەی خۆیەوە خواردن و خواردنەوەی بۆ رەوانە کردوون.

ـ هەروەها جارێکیان کەنیزەکێکی خۆی دەچێت لای ئیمامی عومەر سکاڵای لێ دەکات و دەڵێت: خاتوو صەفیە هەتا ئێستایش هەر رۆژی شەممەی خۆش دەوێت و سەردانی یەهودییەکان دەکات، ئەویش وەڵامی بۆ دەنێرێت و پرسیاری لێدەکات، خاتوو صەفیەیش لە وەڵامدا دەڵێت: سەبارەت بە رۆژی شەممە لەو کاتەوە کە خوا رۆژی هەینی پیرۆز کردووە من یادی شەممەم لەدڵدا نەماوە و خۆشم ناوێت، سەبارەت بە سەردانی یەهودییەکانیش من تا ئێستا هەندێك خزم و کەس و کارم لە

---

[٥١] - الترمذي- سنن الترمذي- ج٥/ص٧٠٩- كتاب (٥٠) المناقب عن رسول الله ﷺ/ باب (٦٤) فضل أزواج النبي ﷺ- الحديث (٣٨٩٤). الإمام أحمد- المسند- ج١٩/ص٣٨٤- الحديث (١٢٣٩٢).

نێوانیاندا هەیە ئەرکی خزمایەتیان بەرامبەر جێبەجێ دەکەم و هیچی تر، پاشان خاتوو صەفیە بە کەنیزەکەکەی گوت: چی وای لێ کردیت ئەو کارە بکەیت؟ وتی: شەیتان. وتی: دەی برۆ لەبەر خودا ئازاد بە و گەردنت ئازاد بێت.

ـ لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ خاتوو صەفیە تەنیا دە فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

ـ لە مانگی رەمەزانی ساڵی پەنجای کۆچی و لە سەردەمی فەرمانڕەوایەتی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیان خاتوو صەفیە کۆچی دوایی کردووە، تەرمی پیرۆزی لە گۆڕستانی بەقیع بەخاك سپێردراوە.

## خێزانی دوازدەیەم:

ـ دوازدەیەم و کۆتا خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو: (مَيْمُونَةُ بِنْتَ الْحَارِثِ)ی کچی (الْحَارِثِ بْنِ حَزْنِ بْنِ بُجَيْرِ)ە، دایکیشی ناوی (هِنْد بِنْت عَوْف الْهِلَالِيَّةِ)یە.

ــ خاتوو مەیمونە خوشکی دایکی خاتوو (زَيْنَبَ بِنْتَ خُزَيْمَةَ)ی خێزانی کۆچکردووی پێغەمبەرە ﷺ، پووری (عَبْدُ اللّهِ بْنُ عَبَّاسٍ)ی ئامۆزای پێغەمبەر ﷺ و (خَالِدُ بْنُ الْوَلِيدِ)ە.

ـ هەرچەندە خاتوو مەیمونە لە رووی ژمارەوە خێزانی دوازدەیەمی پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام لە راستییدا خێزانی نۆیەمی پێغەمبەر ﷺ بووە، چونکە کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ خاتوو مەیمونەی هێناوە، سیان لە خێزانەکانی پێشووی کۆچی دواییان کردبوو، کە ئەوانیش خاتوو: خەدیجە، خاتوو زەینەبی کچی خوزەیمە و خاتوو رەیحانە بوون.

ـ خاتوو مەیمونە بەهەمان شێوەی خاتوو زەینەب و خاتوو جوەیریە سەرەتا ناوی (بَرَّةَ) بووە و پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ ناوەکەی گۆڕیوە بۆ مەیمونە.

ـ بەر لەوەی ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ خاتوو مەیمونە دوو شووی تری کردووە، یەکەمیان بە (مَسْعُودِ بْنُ عَمْروو بْنُ عُمَيْرِ الثَّقَفِيِّ) پاش ئەوەی کە ئەو

تەلاقی داوە و لێی جیا بۆتەوە شووی کردووەتەوە بە (أبي رُهْمِ بْنِ عَبْدِ الْعُزّى) و پاش ماوەیەك ئەویش کۆچی دوایی کردووە، ئیتر خاتوو مەیمونە بۆ جاری دووەم بێوەژن کەوتووە و کەوتۆتە لای (الْعَبَّاس بْن عَبْد الْمُطَّلِب)ی زاوایان کە لەهەمان کاتدا مامی پێغەمبەر ﷺ بووە.

- پاش ئەوەی لە ساڵی شەشەمی کۆچیی پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ هاوەڵەکانی بڕیاری عەمرە کردنیان دا، ئەوەبوو بێباوەڕانی قورەیش بەرەنگاریان بوونەوە و ڕازی نەبوون بەوەی کە ئەو ساڵە پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵەکانی بچنە شاری مەککەوە، تا سەرئەنجام پەیماننامەی حودەیبیەیان مۆر کرد و تێیدا ڕێککەوتن لە سەر ئەوەی کە ساڵی داهاتوو پێغەمبەری خودا ﷺ و هاوەڵەکانی بۆیان هەیە بێنەوە بۆ عەمرە و سێ ڕۆژ لە مەکەیشدا بمێننەوە، هەر بۆیە ساڵی داهاتوو بەر لەوەی بەرەو مەککە بکەونە ڕێ، پێغەمبەری خودا ﷺ خەڵکێکی ڕاسپارد کە خوازبێنی خاتوو مەیمونەی بۆ بکەن، خاتوو مەیمونەیش کە هەواڵەکەی پێ گەیشت، زۆری پێخۆش بوو، بەڵام لە بەر ئەوەی کە خاتوو مەیمونە لە ماڵی (الْعَبَّاس)دا بوو، هەر بۆیە بڕیاری کۆتایی لەسەر مەسەلەکە گێڕایەوە بۆ ئەو.

- کاتێك (الْعَبَّاس)ی مامی پێغەمبەری خودا ﷺ هەواڵەکی بیست زۆری پێخۆش بوو، بە شەرفێکی گەورەی زانی کە جگە لە مام و برازایەتی، لەمەو دوا دەبێتە ئاوەڵزاوای پێغەمبەر ﷺ و لەو ڕێیەیشەوە دیسان تێکەڵییان بۆ دروست ببێت.

- پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ هاتە مەککە، پاش ئەوەی هەموو ئەرکەکانی عەمرەکردنی جێبەجێ کرد و بەرگی ئیحرامی داکەند خاتوو مەیمونەی مارە کرد.

- هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەو ئەرك و کارانەی جێبەجێ کرد، ئیتر ماوەی ئەو سێ ڕۆژە تەواو بوو کە لەگەڵ بێباوەڕانی مەککە لەسەری ڕێکەوتبوون کە لەوەندە زیاتر لە مەککە نەمێننەوە، پاشتر بێباوەڕانی مەککە داوایان لێکرد کە مەککە جێ بهێڵێت، ئەویش ﷺ پێی گوتن من کارێکی وەهام بەدەستەوەیە کە

خاتوو مەیمونە بگوێزمەوە، ئەگەر قبوڵی بکەن ئەوە لێرە دەیگوێزمەوە و خواردن و بۆنەیەکی بۆ ساز دەکەم و ئێوەش بانگهێشت دەکەم بۆ ئەو خوانە، ئەوانیش وەك نەریتی هەمیشەییان وتیان: پێویستمان بە نان و خواردنی تۆ نییە، دەبێت مەککە جێ بهێڵیت، پاشتر پێغەمبەری خودا ﷺ لەسەر داوای بێباوەڕانی مەککە شارەکەی بەجێهێشت و لە مانگی (ذُو القَعْدَة)ی ساڵی حەوتی کۆچی و لە ناوچەی (سَرِف) کە دە میل لە مەککەوە دوور بوو لە نزیك تەنعیمەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ژیانی هاوسەرگیریی لەگەڵ خاتوو مەیمونە دەست پێکرد و ئەوکات خاتوو مەیمونە تەمەنی نزیکەی چل ساڵان بوو.

- هەرچەندە زانایان کۆك نین لەسەر ژمارەی ئەو فەرموودانەی کە خاتوو مەیمونە لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاویەتیەوە، بەڵام زۆرینەیان لە سەر ئەوەن کە خاتوو مەیمونە لە تەمەنی پڕ لە فەڕی لەگەڵ پێغەمبەی خوادا ﷺ زیاتر لە حەفتا فەرموودەی لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ گێڕاوەتەوە.

- لە ساڵی پەنجاویەکی کۆچی خاتوو مەیمونە نەخۆش کەوتووە و داوای کردووە کە ببەنە دەرەوەی مەککە بۆ ناوچەی (سَرِف) ئەوانیش بردویانەتە دەرەوەی مەککە و کە گەیشتونەتە ناوچەی (سَرِف) لە هەمان ئەو شوێنەی کە لەگەڵ پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ یەکەمجار بەیەك گەیشتوون و ژیانی هاوسەرییان دەست پێکردووە، چاوەکانی بۆ دواجار لە یەك ناوە و کۆچی دوایی کردووە، تەرمی پیرۆزیشی هەر لە هەمان شوێن بە خاك سپێردراوە.

- خاتوو مەیمونە کۆتا خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە و پاش ئەو پێغەمبەری خودا ﷺ هیچ خێزانی تری نەهێناوە کە نازناوی دایکی باوەڕدارانی پێ بڕابێت، کاتێکیش وەفاتی کردووە ﷺ هەر ئەو نۆ خێزانەی لە پاش بەجێ ماوە کە لەم چەند زنجیرە باسەدا بە وردی باسی چیرۆکەکانیانمان کرد، کە ئەوانیش خاتوان: (سوودة)، (عَائـشَة)، (حَفْصَة)، (أُمُّ سَلمَة)، (زَيْنَب بِنْتُ جَحْشٍ)، (جُوَيْرِيَة)، (أُمّ حَبِيبَة)، (صَفيَّة) و (مَيْمُونَة) بوون.

ـ مێژوونووسان باسی دوو ئافرەتی تر دەکەن کە پێغەمبەری خودا ﷺ گرێبەستی هاوسەرگیریی لەگەڵ کردوون، بەڵام نەچووەتە لای کەسیان، بە خێزانی ئەو ئەژمار ناکرێن، ئەوانیش: (أسمَاء بنت النُّعْمَان الغفارية الْكِنْدِيّة) و (أُمَيْمَة بِنْت النُّعْمَان بْن شَرَاحِيل) بوون.

ـ هەرچەند زانایان بۆچوونیان جیاوازە لەسەر بەرواری ئەم دوو هاوسەرگیرییە و هۆکاری هەڵوەشاندنەوەیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کۆکن لەسەر ئەوەی کە هیچ کام لەم دوو ئافرەتە بە دایکی باوەڕداران ئەژمار ناکرێن و هیچ کام لەو حوکمانەی کە تایبەتن بە دایکی باوەڕدارانەوە ئەمان ناگرێتەوە، نە لە دونیا و نە لە دوارۆژیشدا.

### فەرموودەی یەکەم:

{اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ، فَإِنَّ الْمَرْأَةَ خُلِقَتْ مِنْ ضِلَعٍ، وَإِنَّ أَعْوَجَ شَيْءٍ فِي الضِّلَعِ أَعْلَاهُ، فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ، وَإِنْ تَرَكْتَهُ لَمْ يَزَلْ أَعْوَجَ فَاسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ} . لە ریوایەتێکی تردا هاتووە: {وَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهَا كَسَرْتَهَا، وَكَسْرُهَا طَلَاقُهَا}[٤٢].

ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودانەی کە ئەگەر هەر بە رووکەش و بە شێوەیەکی سەرپێیی راڤەی بکەین رەنگە ئاڵۆزییەکی زۆری تێدا بەدی بکرێت و قسەو باسی زۆر هەڵبگرێت، هەر بۆیە هەندێك لە موسڵمانان بۆ خۆلادان لە راڤەکردنی فەرموودەکە یەکسەر فەرموودەکە بە لاواز لەقەڵەم دەدەن و لەکۆڵ خۆیانی دەکەنەوە، بەڵام لە راستییدا فەرموودەکە فەرموودەیەکی دروستە و لەم رووەوە هیچ قسە هەڵناگرێت، لەپەراوێزدا ئەو راستییەمان خستۆتە روو.

ئەوانەیشی کە فەرموودەکە بە دروست لە قەڵەم ئەدەن هەندێکجار وەکو پێویست راڤەی تەواوی بۆ ناکەن بە شێوەیەك کە هەموو ئەو رەخنە و گومانانە برەوێنێتەوە کە لەسەری باس دەکرێت.

هەر بۆیە هەندێکجار خەڵکانی ناحەز بۆ مەبەستی خراپی خۆیان بە شێوەی جیا جیا و دوور لە راستیی راڤەی فەرموودەکە دەکەن.

جا من لێرەدا و لە رێی چەند خاڵێکەوە هەوڵ دەدەم کە راڤەیەکی تەواو و شیاو لەسەر فەرموودەکە بخەمە روو، ئومێدەوارم کە بتوانم لە رێیانەوە هەموو ئەو ئاڵۆزییانە برەوێنمەوە کە لای خوێنەر لەسەر فەرموودەکە دروست دەبێت.

یەکەم: لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەر ﷺ باس لەوە دەکات کە ئافرەتان لە چی دروست بوون، گەر واتایەکی فەرموودەکە بکەین دەفەرموێت: ئاگاتان لە ئافرەتان بێت و باش بن بۆیان، چونکە ئافرەت لە پەراسوو دروست بووە،

---

[٤٢] - البخاري- صحيح البخاري- ج٣/ص١٢١٢- كتاب (٦٤) الأنبياء/ باب (٢) قول الله تعالى: ﴿وإذ قال ربك للملائكة إني جاعل في الأرض خليفة﴾- الحديث (٣١٥٣). مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص١٧٨- كتاب (١٨) الرضاع/ باب (١٨) الوصية بالنساء- الحديث (٣٧٢٠).

خوارترین شوێنیش لە پەراسوودا بریتییە لە بەشی سەرەوەی پەراسوو کە زۆر خوارە، پاشان دەفەرموێت: گەر بتەوێ ڕاستی بکەیتەوە دەیشکێنی و گەر وازی لێبهێنی هەر بە خواری دەمێنێتەوە، هەر بۆیە ئاگاتان لە ئافرەتان بێت.

دووەم: ئەم فەرموودەیە باس لە سەرەتا و سەرچاوەی دروست بوون دەکات کە حەوا لە پەراسوویەکی ئادەم دروست بووە، قورئانیش بەهەمان شێوە و لە چەندین شوێندا جەخت لە سەر واتای ئەم فەرموودەیە دەکاتەوە و پشتڕاستی دەکاتەوە، لەوانە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً﴾[٥٣]. واتە: یەکێك لە بەڵگە و نیشانەکانی گەورەیی خوا ئەوەیە کە لە خودی خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون، لە ئایەتێکی دیکەدا دەفەرموێت: ﴿وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً﴾[٥٤]. واتە: خوای باڵادەست لە خۆتان هاوسەری بۆ دروست کردوون.

کەواتە ئەم ئایەتانە هەمان واتای فەرموودەکە پشتڕاست دەکەنەوە، کە خوای پەروەردگار لە خودی ئادەم خۆی هاوسەری بۆ دروست کردووە.

سێیەم: کاتێك دەڵێین: ئافرەت لە بەشێکی پیاو دروست بووە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە پیاو لە ئافرەت گەورەترە، یا پیاو لە ئافرەت بەڕێزترە، یان باشترە، چونکە خوای پەروەردگار لە چەندین ئایەت و دەقی دیکەدا کاتێك ئاماژە بە دروستبوونی مرۆڤەکان دەکات، باس لە یەکسانیبوونیان دەکات، سەرەتای دروستکردنی ژن و پیاو دەگێڕێتەوە بۆ یەك سەرچاوە کە ئەویش خۆڵە، بێ جیاوازیی لە نێوانیاندا، بۆ نموونە خوای پەروەردگار لە چەند دەقێکدا دەفەرموێت:

---

٥٣ - سورة الروم: الآية: ٢١.

٥٤ - سورة النحل: الآية: ٧٢.

- ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ إِذَا أَنتُم بَشَرٌ تَنتَشِرُونَ﴾[٥٥]. واتە: یەكێك لە نیشانەكانی گەورەیی خوای بالادەست ئەوەیە كە ئێوەی لە خۆڵ دروست كردووە، پاشان ئێوە بوونەتە مرۆڤ و بەسەر زەوییدا بلاو بونەتەوە.

- ﴿وَاللَّهُ خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ جَعَلَكُمْ أَزْوَاجاً﴾[٥٦]. واتە: خوای بالا دەست ئێوەی لە خۆڵ دروست كردووە، پاشان لە تنۆكێك ئاو، پاشانیش كردوونی بە دوو رەگەزی جیاواز لە نێر و لە مێ.

- ﴿هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ يُخْرِجُكُمْ طِفْلاً﴾[٥٧].

واتە: ئەو خوایەی كە ئێوەی لە خۆڵ دروست كردووە، پاشان لە تنۆكێك ئاو، پاشان لە تۆزێك ئاوەنمەی هەڵواسراو بە دیواری رەحمدا، پاشان دەتانكاتە منداڵ و دەتانهێنێتە ژیان.

ئەگەر سەرنجی ئەم دەقانە بدەین دەبینین كە خوای پەروەردگار ئەصڵی رەگەزی هەموو مرۆڤەكان بە نێر و مێیانەوە دەگێڕێتەوە بۆ یەك سەرچاوە، كە ئەویش خاكە و بەم پێیەیش هیچ رەگەزێك لەوی تر زیاتر نییە.

چوارەم: سەرەتاو كۆتایی فەرموودەكەی پێغەمبەر ﷺ و مەبەستی سەرەكی لێی ئاماژە و ئامۆژگاریكردن و جەخت كردنە لە سەر ئەوەی كە پیاوان باش بن لەگەڵ خێزانەكانیان، كە دەفەرموێت: {اسْتَوْصُوا بِالنِّسَاءِ} لە سەرەتاو كۆتایی فەرموودەكەدا واتە: ئەمە وەصیەتی منە، ئێوەش كار بەم وەصیەتە بكەن و باش بن لەگەڵ خێزانەكانتاندا و خراپەیان لەگەڵ مەكەن.

پێنجەم: كاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ وشەی {أَعْوَجَ} بەرامبەر بە ئافرەتان بەكار دەهێنێت لەم فەرموودەیەدا، زانایانی زمانی عەرەبی دەڵێن: وشەی {عوَج} لە زمانی عەرەبیدا بە سێ واتا دێت، كە بریتییە لە: (حنو)، (عطف)، (میل)،

---

[٥٥] - سورة الروم: الآية: ٢٠.

[٥٦] - سورة فاطر: الآية: ١١.

[٥٧] - سورة غافر: الآية: ٦٧.

هەرسێکیان بە مەبەستی سۆز و خۆشەویستی و خواربوونەوە و چەمانەوە دێت بەلای کەسی خۆشەویستدا، واتە دەڵێن کە یەکێ حەنانی هەیە، واتە سۆز و بەزەیی هەیە، هەر بۆیە لە واقیعیشدا دەبینین ئافرەت هەمیشە چەماوەو سۆز و بەزەیی و خۆشەویستی بەلای کەسی بەرانبەردا و بەسەر منداڵەکانییدا هەیە، کە ئەویش لە سۆز و بەزەییەوە ئەو چەمانەوەیەی بۆ دروست بووە.

هەر بۆیەیش پێغەمبەر ﷺ دەیشوبهێنێت بە پەراسوو، چونکە پەراسوویش چەماوەیە، چەماوەیی و خواربونەوەی پەراسوویش نەخوازراو و عەیبدار نییە، بەڵکو زۆر پێویست و ناوازەیە، چونکە چەمانەوەی پەراسوو بە مەبەستی پاراستنی هەستیارترین ئەندامی لاشە دێت کە دڵە، سۆز و چەمانەوەی ئافرەتیش بە مەبەستی پاراستن و پێگەیاندنی هەستیارترین خانەکانی کۆمەڵگا دێت کە خێزانە.

واتە چۆن پەراسوو خۆی بەسەر دڵدا چەمانووەتەوە بۆ ئەوەی هیچ زیانێکی پێ نەگات، ئافرەتیش بەهەمان شێوە چەماوەتەوە بە مەبەستی پاراستنی خێزان و نەوەکانی دوارۆژ کە هیچ شتێك زیانیان پێ نەگەیەنێت.

شەشەم: پێغەمبەر ﷺ لەم فەرموودەیەدا ئاماژە بە جۆری بیرکردنەوەو باری دەروونیی ئافرەت دەکات کە خوای پەروەردگار چۆنی دروست کردوون؟ چ سۆز و عاتیفەیەکی پێ بەخشیون، واتە پێغەمبەر ﷺ دەیەوێت پیاوان لەم راستییە ئاگادار بکاتەوە، کە ئافرەتان وا دروست بوون و زیاتریش ئەم لایەنە زاڵە بەسەریاندا، بۆیە دەبینین زۆر کات لێکدانەوە و تێڕوانین و هەڵوێستی ئافرەتان لەگەڵ پیاوان لەمەڕ مەسەلەکان جیاوازە، ئێمە دەبێت ئەم جیاوازییە قبوڵ بکەین و قەت هەوڵی گۆڕینی نەدەین، چونکە سروشتی ئافرەت وایە و ناشتوانێت وەها نەبێت، ئەم سروشتەیشی زۆر پێویستە بۆ ئەوەی بتوانێت بە ڕۆڵی پەروەردەکاری خۆی هەستێت لە ژیاندا، هەر بۆیەش پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەکەدا دەفەرموێت: {فَإِنْ ذَهَبْتَ تُقِيمُهُ كَسَرْتَهُ} واتە: ئەگەر بتەوێت راستی بکەیتەوە و ئەو چەمانەوە و سۆزەی تیا نەهێڵیت دەیشکێنیت و نایەڵیت وەك سروشتی خۆی

بیر بکاتەوە و بژی و بە رۆڵی خۆی هەستێت، کەواتە ئەوەی تۆ بە بۆچوونی خۆت پێت وایە راستکردنەوەیە بۆ ئافرەت، لە راستییدا شکاندنە.

حەوتەم: ئەگەر خەڵکانێك بیانەوێت ئەم فەرموودەیە وا راڤە بکەن کە مەبەست پێی باسکردنی خواریی و خراپیی ئافرەتانە، ئەوە دەکەونە کێشە لەگەڵ چەندین فەرموودەی تر کە ئەم جۆرە لێکدانەوە و بۆچوونانە بەرامبەر ئافرەت رەت دەکەنەوە، لەوانە:

ـ پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: {إِنَّمَا حُبِّبَ إِلَيَّ مِنْ دُنْيَاكُمُ النِّسَاءُ، وَالطِّيبُ، وَجُعِلَتْ قُرَّةُ عَيْنِي فِي الصَّلَاةِ}[٥٨]. واتە: سێ شت لە دونیادا خۆشەویست کراون بەلامەوە، یەکەمیان ئافرەتە، جا ئایا دەگونجێت پێغەمبەری خودا ﷺ بە خراپیش ناویان ببات و خۆشیشی بوێن؟ ئایا لە پێغەمبەری خودا ﷺ دەوەشێتەوە شتی خراپی خۆش ویستبێت؟ بەدڵنیاییەوە نەخێر.

ـ یەکێکی تر لەو فەرموودانە ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {خَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ}[٥٩]. واتە: باشترین و چاکترین خۆشیی دونیا ئافرەتێکی باش و گونجاوە، جا گەر ئافرەت خوار و نالەبارە، چۆن پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: باشترین خۆشییەکانی دنیا بریتییە لە ئافرەتێکی باش.

هەر بۆیە ئەم فەرموودانە و چەندین فەرموودەی تری هاوشێوەی ئەمانە ئەو گومانانە رەت دەکەنەوە کە پێغەمبەر ﷺ لێرەدا ویستبێتی تەشهیر بە ئافرەت بکات و بە خوار ناوی ببات، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێغەمبەر ﷺ لێرەدا دەیەوێت

---

[٥٨] - النسائي- سنن النسائي الكبرى- ج٥/ص٢٨٠- كتاب (٧٩) عشرة النساء/ باب (١) حب النساء- الحديث (٨٨٨٧). البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي)- سنن البيهقي الكبرى- ج٧/ص٧٨- كتاب (٤٦) النكاح/ باب (٥٩) الرغبة في النكاح- مكتبة دار الباز/ مكة المكرمة- ط/١٤١٤- تحقيق: محمد عبد القادر عطا- الحديث (١٣٢٣٢).

[٥٩] - مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص١٧٨- كتاب (١٨) الرضاع/ باب (١٧) خير متاع الدنيا المرأة الصالحة- الحديث (٣٧١٦). ابن حبان- صحيح ابن حبان- ج٩/ص٣٤٠- ذكر البيان بأن المرأة الصالحة للمؤمن خير متاع الدنيا- الحديث (٤٠٣١).

ڕێز لە ئافرەتان بنێت و سروشتی بیرکردنەوە و هەست و سۆزیان ڕوون بکاتەوە، وەصیەتی پیاوان بکات بەوەی کە باش بن لەگەڵیاندا.

**فەرموودەی دووەم:**

عَنْ أَبِي سَعِيدٍ الْخُدْرِيِّ قَالَ: (خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فِي أَضْحًى – أَوْ فِطْرٍ – إِلَى الْمُصَلَّى، فَمَرَّ عَلَى النِّسَاءِ فَقَالَ: {يَا مَعْشَرَ النِّسَاءِ تَصَدَّقْنَ، فَإِنِّي أُرِيتُكُنَّ أَكْثَرَ أَهْلِ النَّارِ}. فَقُلْنَ: وَبِمَ يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ: {تُكْثِرْنَ اللَّعْنَ، وَتَكْفُرْنَ الْعَشِيرَ، مَا رَأَيْتُ مِنْ نَاقِصَاتِ عَقْلٍ وَدِينٍ أَذْهَبَ لِلُبِّ الرَّجُلِ الْحَازِمِ مِنْ إِحْدَاكُنَّ}. قُلْنَ: وَمَا نُقْصَانُ دِينِنَا وَعَقْلِنَا يَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ؟. قَالَ: {أَلَيْسَ شَهَادَةُ الْمَرْأَةِ مِثْلَ نِصْفِ شَهَادَةِ الرَّجُلِ}. قُلْنَ: بَلَى. قَالَ: {فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ عَقْلِهَا، أَلَيْسَ إِذَا حَاضَتْ لَمْ تُصَلِّ وَلَمْ تَصُمْ}. قُلْنَ: بَلَى. قَالَ: {فَذَلِكَ مِنْ نُقْصَانِ دِينِهَا}..)[٦٠].

ئەم فەرموودەیەش دیسانەوە فەرموودەیەکی دروستە و لە زۆربەی صەحیحەکاندا هاتووە و واتا زمانەوانییەکەی و رووکەشەکەی ئەوەیە: کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە رۆژی جەژنی قوربان، یان رەمەزاندا بووە –دیارە گومان هەیە کە کام جەژن بووە– رۆیشتووە بەرەو موصەللا –ئەو شوێنەی نوێژی جەژنەکانی لێ دەکرا– بەلای ئافرەتەکاندا رۆیشت.

پێی فەرموون: ئەی کۆمەڵی ئافرەتان خێر و چاکە زۆر بکەن، چونکە وام نیشان دراوە کە ئێوە زۆرینەی ئەهلی ئاگر بن. ئافرەتەکان وتیان: لە بەر چی ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ؟ فەرمووی: لەبەر ئەوەی ئێوە زۆر کات زمانتان بە شێوەی ناشیاو بەکاردەهێنن، قسەی بە خەڵك پێ دەڵێن، تانەی پێ دەڵێن، چاکە و شتی

---

[٦٠] - البخاري- صحيح البخاري- ج٢/ص٥٣١- كتاب (٣٠) الزكاة/ باب (٤٣) الزكاة على الأقارب- الحديث (١٣٩٣). مسلم- صحيح مسلم- ج١/ص٦١- كتاب (٢) الإيمان/ باب (٣٦) بيان نقصان الإيمان بنقص الطاعات وبيان إطلاق لفظ الكفر على غير الكفر بالله ككفر النعمة والحقوق- الحديث (٢٥٠).

بەرامبەر لە بیر دەکەن، کەسێکم نەبینوە کە خۆی دین و ژیریی ناتەواو بێت، بەڵام توانای بردنی بیر و ژیریی پیاوێکی زۆر دانای هەبێت.

وتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ناتەواویی دین و ژیریمان لە چییەوەیە؟ فەرمووی: ئایا گەواهی ئافرەتێك بە نیوەی گەواهی پیاوێك نییە؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: دە ئەوە هی ئەوەیە کە ژیریی تەواو نییە. پاشانیش فەرمووی: ئەی کە دەکەوێتە سوڕی مانگانەوە واز لە نوێژ و ڕۆژوو ناهێنێت؟ وتیان: بەڵێ. فەرمووی: ئەوەیش هی ئەوەیە کە ئایینی ناتەواوە.

ئەمە واتا زمانەوانییەکەی فەرموودەکەیە و خەڵکانێکی نەزان وای ڕاڤە دەکەن کە گوایە مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ لەم فەرموودەیە سووکایەتیکردن بووە بە ئافرەتان، بەڵام ئەگەر بگەڕێینەوە سەر ڕاڤەکردنی زانایان دەبینین ئەم شێوە ڕاڤەکردنە پێچەوانەی ڕاستییەکانە، ئێمەیش لێرەدا و بە مەبەستی ڕاڤەکردنی فەرموودەکە بەشێوەیەکی زانستیی و شیاو کۆمەڵێك تێبینی و سەرنج لە سەر فەرموودەکە بخەینە ڕوو:

یەکەم: کاتێك ئێمە دەمانەوێت بە شێوەیەکی واقعییانە ڕاڤەی فەرموودەیەك بکەین پێویستە بگەڕێینەوە سەر ئەو کات و شوێنەی کە ئەم فەرموودەیەی تێدا هاتووە بۆ ئەوەی وەك خۆی لە واتا و مەبەستی فەرموودەکە تێ بگەین، وەکو باسمان کرد ئەم فەرموودەیە لە ڕۆژی جەژندا و لە ناو موصەلادا گوتراوە، کە ڕۆژی گەردنئازادیی و لێبوردەیی و قسەی خۆشە، شوێنەکەیش شوێنی پەرستش و کڕنووشبردن و خوا لەخۆ ڕازیکردنە، جا ئایا دەگونجێت پێغەمبەری خودا ﷺ کە خوای پەروەردگار شایەتی ڕەوشتبەرزیی و دڵنەرمیی و بەسۆزیی بۆ دەدات بەرامبەر بە باوەڕداران، لە کات و شوێنێکی ئاوادا ڕۆژی جەژن و موصەلای هەڵبژاردبێت بۆ سووکایەتیپێکردنی ئافرەتان و بێهیوا کردنیان و بەکەم نیشاندانیان بەرامبەر بە پیاوان؟! ئەمە شتێکە قەت لە ڕەوشتی بەرزی ئەو پێغەمبەرە نازدارە ﷺ ناوەشێتەوە.

خۆ ئەگەر ئەم فەرموودەیە لەکاتی تاوانبارکردنی، یان سزادانی ئافرەتێکدا بهاتایە لەسەر هەڵەیەکی گەورە بۆ نموونە زینای کردبێت، یان دزی کردبێت، یان هەر هەڵەیەکی تری کردبێت، دەمانگوت لەوانەیە وابێت، یان ئەگەر لە کاتی تووڕەبوون و ناڕەحەتی پێغەمبەردا ﷺ بهاتایە بەرامبەر ئافرەتان لە دەرئەنجامی کردارێکی ناشیاو، یان هەر دەکرا ئەو جۆرە گومانە ببرایە، هەرچەندە پێغەمبەری خوا ﷺ لە کاتی خۆشی و ناخۆشیشدا ئەوەی حەق نەبێت نەیفەرمووە، بەتایبەتیش لەم کات و شوێنەدا کە هیچ پاساوێك نییە بۆ ئەم جۆرە هەڵوێستانە تا فەرموودەکە وا راڤە بکرێت.

**دووەم:** بەکارهێنانی وشەی (نقص) واتە: (کەمی) لە ژیریی و ئایین دا، مەبەست پێی کەمی ژمارە و کەڕەتە، وەکو دوایی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی راڤەی دەکات و دەفەرموێت: لە شایەتیدا شایەتی دوو ئافرەت بەرانبەر یەك پیاوە، یان لە کاتی سوڕی مانگانەدا کۆمەڵێك لە نوێژ و پەرستشەکانیان دەفەوتێت، کە ئەمانە کەمییە لە ژمارە و حوکمدا، نەك سووکییە لە کەسایەتی و ناخدا، جیاوازییەکی زۆریش هەیە لە نێوان کەمیی ژمارە و حوکم لەگەڵ سووکیی کەسایەتی و ناخ.

**سێیەم:** مەبەستی سەرەکی لە فەرموودەکە و هۆکاری بنەڕەتی قسەکان وەکو لە سەرەتاکەیدا بۆمان دەردەکەوێت هەوڵدانە بۆ هەڵنانی ئافرەتان بۆ کاری چاکە و ئەنجامدانی پەرستشی زیاتر بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەموکوڕییانەی کە بە هۆی هەندێك تایبەتمەندیی جەستەیی ئافرەتەوە لە پەرستشەکانیدا روو دەدات، هەروەها ئاگادارکردنەوە و دوور خستنەوەیانە لەو ئاکار و رەفتارە خراپانەی کە زیاتر ئافرەتان ئالوودە و تووشی دەبن، بە مەبەستی ئەوەی کە خۆیان چاکە بکەن، ئەمەش بەڵگەی دڵسۆزیی پێغەمبەری خودایە ﷺ بەرامبەر بە ئافرەتان، نەك رق لێبوونەوە و بەسووك سەیرکردن، چونکە ئەگەر یەکێك رقی لە یەکێك بێت و بەسووك سەیری بکات نایەت ئامۆژگاری بکات و سەرزەنشتی بکات بەڵکو حەز

دەکات لەیەك جێ سەدجار ملی بشکێ، پێشینەکانی ئێمەش راست دەکەن کە گوتویانە: (دۆستم ئەو کەسەیە کە دەمگرێنێ).

**چوارەم:** ئەم فەرموودەیە بەڵگەیەکی زۆر روون و ئاشکرایە لە سەر رێز و مافی ئافرەت لە ئیسلامدا، کە دەبینین چۆن پێغەمبەری خودا ﷺ بەسەری کردونەتەوە، بەتایبەتی بەر لە پیاوان لەو رۆژە پیرۆزەدا قسەی بۆ کردوون و ئامۆژگاریی کردوون، لەملایشەوە ئافرەتان بوێرانە و راشکاوانە پرسیار و بۆچوونەکانیان عەرزی پێغەمبەری خودا ﷺ کردووە و ئەویش چەند بە سنگێکی فراوانەوە قسەکانی لێ قبوڵ کردوون و بۆچوونەکانی خۆی و حوکمە شەرعییەکانی بۆ روون کردوونەتەوە، ئایا لە رۆژگارەکانی سەدەی بیست و یەك و بانگەشەی ماف و ئازادی ژناندا کەس ئەو مافەی هەیە ئاوا قسە لە قسەی سەرکردەیەکدا بکات و قسەکانی پێ ببڕێت و ئەویش بەو شێوەیە بە سنگێکی فراوان و گیانی بەزەیی و لەخۆبوردەییەوە قسەکان وەربگرێت و روونکردنەوەیان لەسەر بدات؟.

**پێنجەم:** کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ قسە لەسەر ئەم کەموکورییانەی ئافرەتان دەکات مەبەستی ئەوە نەبووە کە ئەم جۆرە هەستکردنە لە ئافرەتدا قووڵ بکاتەوە، یان بڵێ هەموو ئافرەتان هەر وان و قسەی ناشیرین دەکەن و هەر وایش دەمێننەوە، بەڵام مەبەستی ئەوە بووە ئافرەتان ئەم سیفەتەیان تێدایە با وازی لێ بهێنن، یان هەوڵ بدەن لەبەر ئەوەی نوێژەکەیان کەمترە نوێژی سوننەت زۆر بکەن لەوکاتانەدا کە پاکن، بۆ ئەوەی بتوانن ئەو لایەنە پڕ بکەنەوە، ئەم جۆرە هەڵنانەش پێغەمبەری خودا ﷺ نەك تەنیا بەرامبەر بە ئافرەت بەڵکو زۆر جار بەرامبەر بە پیاوانیش بەکاری هێناوە.

بۆ نموونە پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {إِنَّا أُمَّةٌ أُمِّيَّةٌ لاَ نَكْتُبُ وَلاَ نَحْسُبُ}[61]. واتە: ئێمە ئومەتێکی نەخوێندەوارین، نووسین و ئەژماردەکردن نازانین، لێرەدا خۆ مەبەستی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە نییە گیانی نەخوێندەواریی لە ئومەتی ئیسلامیدا قوڵ بکاتەوە، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە هەڵمان بنێت کە خوێندەوار بین و خۆمان چاك بکەین، چونکە ئێمە ئومەتی (إقرأ) و خوێندەوارین، ناکرێت نەخوێندەوار و نەفام بین.

**شەشەم:** مەبەستێکی تری فەرموودەکە بریتییە لە روونکردنەوەی چەند حوکمێکی شەرعی بۆ ئافرەتان، لەوانە: هەڵنانیان بۆ کاری چاکە و دوورخستنەوەیان لە خراپە، حوکمی شایەتی ئافرەت و پەرستشیان و کاریگەری ژنان لەسەر پیاوان، روونکردنەوەی هەر یەك لەم حوکمە شەرعییانە قسەی زۆر هەڵدەگرێت و لە شەرعیشدا حوکم تەنیا لە فەرموودەیەکەوە وەرناگیرێت، بۆ زیاتر روونکردنەوەی ئەم حوکمانە ئەم چەند خاڵە دەخەینە روو:

أ- کاتێك شارع حوکمێکی شەرعی دادەنێت هەر چۆنێك بێت و هەرچەندێك بێت، ئەگەر کەسەکان پێوەی پابەند بن بە هیچ شێوەیەك نابێتە مایەی کەموکوڕی، یان سووکی بۆ کەسەکان، شایەتی ئافرەت یان پەرستشی هەرچەند و هەرچۆن بێت پەروەردگار وای دیاری کردووە، کەواتە مایەی نەنگی نییە، بۆیە کاتێك نەخۆشێك لەبەر نەخۆشیی رۆژووی رەمەزانی پێ ناگیرێت، یان کەسێکی گەشتیار کە نوێژەکانی کورت دەکاتەوە، ئەمانە هیچیان نابنە مایەی کەموکوڕی یان بەکەم سەیرکردنی مرۆڤەکان، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێغەمبەری خودا ﷺ لەوبارەیەوە دەفەرموێت: {إِنَّ الله تعالى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ كَمَا يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى

---

[61] - البخاري- صحيح البخاري- ج٢/ص٦٧٥- كتاب (٣٦) الصوم/ باب (١٣) قول النبي ﷺ لا نكتب ولا نحسب- الحديث (١٨١٤). مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٧٥٩- كتاب (١٣) الصيام/ باب (١) فضل شهر رمضان- الحديث (١٥).

عَزَائِمُهُ}[٦٢]. واته: خـوای گـەورە چـەندی پێخۆشـە کـە فەرمانـەکانی وەکو خـۆی جێبـەجێ بکرێـت لـە کاتـە ئاسـاییەکاندا، ئەوەندەیـشی پـێ خۆشـە کـە مۆڵـەت و ئاسانکارییەکانی جێبەجێ بکرێت لە کاتە نائاساییەکاندا، بۆیـە کاتێك ئـافرەت لـە سووڕی مانگانەدا واز لە نوێژ دێنێت یان ڕۆژوو، ئەمەیش دیسانەوە جێبـەجێکردنی فەرمانی خوای گەورەیە و خوای گەورە ئەم کـارەی پـێ خۆشـە، ئـیتر چۆن ئەمـە دەبێتە مایەی کەمی یان سووکی ئافرەتان؟

ب ـ سەبارەت بەوەی کە فەرموودەکـە ئامـاژەی پـێ دەکـات کـە شـایەتی دوو ئافرەت بە پیاوێك دەچێت، ئەمـە حـوکمێکی ڕەهـا نییـە، بـەڵکو شـایەتی ئـافرەت بەپێی ئەو بوار و بابەتەی شایەتی تێدا دەدات دەگۆڕێ، لە هەندێك بواردا شـایەتی ئافرەت هاوتای شایەتی پیاوە و لە هەندێك بواریشدا شـایەتی ئـافرەت لـە شـایەتی پیـاو بـەهێزترە، بەتایبـەتی لـەو بوارانـەدا کـە تایبـەتن بـە ئافرەتانـەوە، وەکـو: مەسـەلەی شـیر پیـدان، کـچێنی ئـافرەت، عیـددە، نەسـەب و کۆمـەڵێ مەسـەلەی هەستیاری دیکە.

بەڵام ئەو بوارانەی کە پەیوەندیی بە ئافرەتەوە نییە وەکو: بـواری بازرگـانی و کڕین و فرۆشـتن، ئەمانـە چـونکە ئـەرکی ئـافرەت نـین، ئـافرەت زۆر خـەمی پێـوە هەڵناگرێت، بۆیە دەکرێـت زوو لەبیریـشی بـچێت، بۆیـە خـوای کاریـەجێ لـەمجۆرە بوارانەدا شایەتی دوو ئافرەتی بە پیاوێك وەرگرتووە.

یان هەندێك بابەتی تر هەیە وەکو بابەتـەکانی تـاوانکردن و سـزادان دەربـارەی پیـاو کوشـتن و دزی و تـاڵانکردن، لـەم بوارانـەدا ئیـسلام وەکـو ڕەچـاوکردنێك بـۆ هەستی ناسکی ئـافرەت و پاراسـتنی تایبەتمەندییـە دەروونـی و جەسـتەییەکانی و نەشێواندنی ڕۆڵی پەروەردەکارانەی لە کۆمەڵدا، ئافرەتی لە ئـەرکی شـایەتیدان لـە سەر ئەم جۆرە بابەت و ئاکارە ناشیاو و زبرانە پاراستووە و دووری خستووەتەوە.

---

[٦٢] - إبن حبان- صحيح إبن حبان- ج٢/ص٦٩- الحديث (٣٥٤)- قال شعيب الأرنؤوط: إسناده صحيح.

ت ـ لەگـەڵ هـەموو ئەمانەیـشدا نابێـت ئـەوە لـەیاد بکـەین کـە لـە رووی زانستیـشەوە کێشی مێشکی پیـاو لـە کێـشی مێـشکی ئـافرەت قورسـترە، بـەڵام لەبەرانبەر ئەمەدا ئافرەت لایەنی سۆزداری بـەهێزترە و لـە ململانێـی نێـوان ژیریـی پیاو و سۆزی ئافرەت، سـۆزی ئـافرەت زاڵ دەبێـت، پێغەمبـەری خـوداش ﷺ لـە فەرموودەیەکیـدا بـە راشـکاوی ئامـاژە بـەم راستییە دەکـات، ئەمـەش پەیوەنـدی بەوەوە نییە کە کێ لە کێ باشـترە؟ بـەڵکو پەیوەنـدی بـە رۆڵ و ئـەرکی ئـەم دوو رەگەزەوە هەیە لە ژیاندا، پیاو کە ئەرکی دابینکردنی بژێویی ژیانی بەسـەردا دراوە پێویستی زیاتری بە ژیریی و بیرکردنەوە و مێشك هەیـە، لـە بەرامبەریـشدا ئـافرەت کـە بەخێوکـەر و پـەروەردەکارە لـە کۆمـەڵگادا پێویـستییەکی زۆری بـە سـۆز و خۆشەویستی هەیـە، بۆیـە خـوای کاربـەجێ هەریەکـەیان بـەپێی پێویـستی خۆیـان بەهرەی پێداون.

جا ئەگەر وتمان ئافرەت کەمعەقڵە و بەڵام لەگـەڵ ئەوەشـدا بتوانێـت زاڵ بێـت بەسەر پیاوێکی زۆر دانا و ژیردا و تەواو کۆنترۆڵی عەقڵی بکات، وەکـو پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئامـاژەی پـێ دەکـات، ئایـا لـەم هاوکێـشەیەدا کـێ کەمعەقڵـە و کـێ زۆر عاقڵە؟ بەدڵنیاییەوە لە خشتە براو کەمعەقڵە نەك لە خشتەبەر.

لە کۆتاییدا دەبێت ئێمە ئەو راستییە لەبیر نەکەین کە ئـایینی پـیرۆزی ئیـسلام رێــزی تــەواوی بــۆ هــەموو پێکهاتــەکانی ئــەم بونــەوەرە دابــین کــردووە و تایبەتمەندییـەکانی رێـز لێگرتـووە و پاراسـتووە، هەریەکـە ئـەرك و رۆڵێکـی پـێ سپێردراوە کە لەگەڵ بونیاتی جەستەی دەروونی ئەو بونەوەرەدا گونجاو بێت.

نەنگی و سووکی لەوەدایە کە مـرۆڤ ئەرکـەکانی خـۆی جێبـەجێ نـەکات و لێـی لابدات، نەك بە پێچەوانەوە.

هەرکاتێکیش ویـستمان راڤـەی فەرموودەیـەك بکـەین پێویـستمان بەوەیـە کـە هــەموو فــەرموودە هاوشــێوە و هاوبابەتــەکانی وەربگــرین و لــە دەرنجــامی خوێندنەوەیەکی زانستیی و بابەتیانە حوکمە شـەرعییەکانیان لـێ وەربگـرین، نـەك

تەنیا لە روانگەی فەرموودەیەکەوە و بە پێی تێگەیشتنی خۆمان چۆن بمانەوێت ئاوا راڤەی بکەین.

**فەرموودەی سێیەم:**

(لَمَّا قَدِمَ مُعَاذٌ مِنْ الشَّامِ سَجَدَ لِلنَّبِيِّ ﷺ قَالَ: {مَا هَذَا يَا مُعَاذُ؟} قَالَ: أَتَيْتُ الشَّامَ فَوَافَقْتُهُمْ يَسْجُدُونَ لِأَسَاقِفَتِهِمْ وَبَطَارِقَتِهِمْ، فَوَدِدْتُ فِي نَفْسِي أَنْ نَفْعَلَ ذَلِكَ بِكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {فَلَا تَفْعَلُوا" فَإِنِّي لَوْ كُنْتُ آمِرًا أَحَدًا أَنْ يَسْجُدَ لِغَيْرِ اللَّهِ لَأَمَرْتُ الْمَرْأَةَ أَنْ تَسْجُدَ لِزَوْجِهَا} ..)[٦٣].

واتە: کاتێك موعازی کوڕی جەبەل لە شام گەڕایەوە کڕنووشی بۆ پێغەمبەر ﷺ برد، پێغەمبەر ﷺ کە ئەم کارەی لە موعاز بینی پێی سەیر بوو فەرمووی: ئەمە چییە ئەی موعاز؟. موعازیش لەوەڵامدا وتی: چووم بۆ شام دەمبینی ئەوان ـ ئەهلی شام ـ کڕنووشیان بۆ پیاوە ئایینییەکان دەبرد، منیش پێم خۆش بوو کڕنووشت بۆ ببەین و بەم شێوەیە رێزت لێ بگرین. پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: کاری وامەکەن، چونکە گەر بگونجایە و دروست بوایە ئەمر بکەم بە کەسێك کڕنووش بۆ کەسێکی تر ببات، ئەوا ئەمرم دەکرد بە ئافرەت کە کڕنووش بۆ پیاوەکەی ببات.

ئەمە سەبارەت بە واتای زمانەوانی فەرموودەکە.

ئەم فەرموودەیەش دیسانەوە یەکێکە لەو فەرموودانەی کە ئەگەر مرۆڤ سەرپێیی واتاکەیان لێك بداتەوە، ئەوە ئاڵۆزیی و گومانێکی زۆری بۆ دروست دەبێت، جا ئێمە لێرەدا و لە پێناو خۆلادان لەو جۆرە راڤەکردن و راییکردنە و بە

٦٣ - إبن ماجة (محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني)- ج١/ص٥٩٥- كتاب (٩) النكاح/ باب (٤) حق الزوج على المرأة- دار الفكر/ بيروت- تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي- الحديث (١٨٥٣). البيهقي- سنن البيهقي الكبرى- ج٧/ص٢٩٢- كتاب (٥٢) القسم والنشوز/ باب (٢) ما جاءفي بيان حقه عليها- الحديث (١٤٤٨٨). إبن حبان- صحيح إبن حبان- ج٩/ص٤٧٩- الحديث (٤١٧١)- قال شعيب الأرنؤوط: إسناده حسن.

مەبەستی نەهێشتن و رەواندنەوەی ئەو جۆرە ئالۆزی و گومانانە ئەم چەند خاڵە لە سەر فەرموودەکە دەخەینە روو:

یەکەم: ئەم فەرموودەیە خۆی لە خۆیدا لـە رووی رێگـەکانی گێڕانەوەیـەوە بـە کۆمەڵێك ریوایـەت هـاتووە کـە جیـاوازن لـە یـەکتر، هـەر یەکـەیان هۆکـاری هـاتنی فەرموودەکە بۆ شتێك دەگێڕێتەوە کە جیاوازە لەوی تر.

هەنـدێك لەوانـە هۆکـاری فەرموودەکـە بـۆ ئـەوە دەگێڕنـەوە کـە لـە سـەرەوە باسمان کرد کە گوایە کاتێك موعاز لە شام گەڕاوەتەوە کڕنووشی بۆ پێغەمبەر ﷺ بردووە و پێغەمبەریش ﷺ ئەم فەرموودەیەی فەرمووە.

هەندێکی تر بۆ ئەوەی دەگێڕنەوە کە گوایـە رۆژێکیـان پێغەمبـەری خـودا ﷺ لە ناو کۆمەڵێك لە هاوەڵەکانیـدا بـووە و وشـترێك هـاتووە کڕنووشـی بـۆ بـردووە و پاشان هاوەڵەکانی فەرموویانە: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ کڕنووشت بۆ نەبەین لـە کاتێکدا ئـاژەڵ و رووەك کڕنووشـت بـۆ دەبـەن؟ ئێمـە لـەوان لـە پێـشترین کـە کڕنووشت بۆ ببەین، ئەویش لە وەڵامدا ئەو فەرموودەیەی فەرمووە[٦٤].

هەنـدێکی تـر بـۆ ئـەوەی دەگێڕنـەوە کـە گوایـە ئافرەتێـك هاتووەتـە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و لێـی پرسـیوە: ئـەی پێغەمبـەری خـودا ﷺ فـڵان کەسـی ئامۆزام هاتۆتە داوام، جا حەز دەکەم بزانم مافی پیاو بەسەر خێزانەکەیـەوە چـییە؟ ئەگەر زانییم دەتوانم جێبەجێی بکەم شـووی پـێ دەکـەم، ئەگـەریش بـزانم نـاتوانم جێبەجێی بکەم شوو ناکەم، پێغەمبەریش لە وەڵامدا وای فەرمووە[٦٥].

هەندێکی دیکە بۆ ئەوەی دەگێڕنەوە: کە گوایە کۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ وشتریان دەبێ و وشترەکەیان بـەرەڵا دەکـەن لـە نـاو باخێکدا، جـا بـە هـۆی ئەوەی کە وشترەکە لەوەڕ و جێگەکەی باش دەبێ هار دەبێ و ئیتر کەس ناتوانێت

---

٦٤ - الهيثمي- مجمع الزوائد ومنبع الفوائد- ج٨/ص٢٨٧- الحديث (١٤١٦٣)- إسناده حسن.

٦٥ - البيهقي- سنن البيهقي الكبرى- ج٧/ص٨٤- كتاب (٤٦) النكاح/ باب (٦٥) من تخلى لعبادة الله إذا لم تتق نفسه إلى النكاح- الحديث (١٣٢٦٣).

نزیکی بکەویت و ناتوانن بەکاری بهێنن، هەتا بە پێغەمبەری خودا ﷺ دەڵێن: پێغەمبەری خودایش ﷺ لەگەڵیان دەچێتە باخەکەوە و وشترەکە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەبینێت دێت بەرەو رووی و کڕنووشی بۆ دەبات، هاوەڵەکانیش کە ئەمە دەبینن دەڵێن: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر ئەو بێزمانە کڕنووشت بۆ بەرێت ئێمە لە پێشترین بەوەی کە کڕنووشت بۆ ببەین، پێغەمبەریش ﷺ لە وەڵامدا ئەم فەرموودەیە دەفەرموێت[٦٦].

ئەمانە و چەندین هۆکاری تر و شێوەی تر لە سەرچاوەکان و پەڕتووکەکانی فەرموودەدا سەبارەت بە هاتنی فەرموودەکە باس دەکرێت.

**دووەم**: بەدەر لەوەی کە هۆکاری فەرموودەکە هەرچی بووبێت، دەقی فەرموودەکە خۆی بۆ خۆی دروستە و لە چەندین رێگەوە هاتووە و رێگەکانی یەکتر پشتڕاست دەکەنەوە.

**سێیەم**: ئەگەر بە وردی سەرنجی دەقی فەرموودەکە بدەین دەبینین پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {لَوْ كُنْتُ آمِرًا} وشەی (لو) لە زمانی عەرەبیدا پێی دەوترێت (حرف إمتناع لإمتناع) واتە: (لو) لە هەر رستەیەکدا بێت وەڵامەکەی هەرگیز نایەتەدی بەهۆی ئەوەی کە مەرجەکەی نایەتە دی.

جا لێرەدا پیتی (لو) مانای فەرموودەکە وا لێ دەکات کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: ناتوانم فەرمان بکەم بە ئافرەت کە کڕنووش بۆ پیاوەکەی بەرێت، چونکە دروست نییە کەس کڕنووش بۆ کەس ببات.

**چوارەم**: مانای کڕنووشبردن لە فەرموودەکەدا مانایەکی (مجاز)یە، مەبەست لێی ئەنجامدانی کاری پەرستش نییە بەرامبەر بە پیاو، چونکە ئەمە مرۆڤ لە بازنەی باوەڕ و ئیسلام دەباتە دەرەوە، ئیسلامیش بۆیە هاتووە تا مرۆڤەکان لە کۆتی کۆیلایەتی و بەندایەتی رزگار بکات، هەموو خەڵکی بەرەو بەندایەتی

---

٦٦ - الإمام أحمد- المسند- ج٢٠/ص٦٤- الحديث (١٢٦١٤).

راستەقینە و بەرەو خوا ببات، جا چۆن دەگونجێت ئێستا بێت رەگەزێك بكاتە كۆیلەی رەگەزەكەی تر و بە كۆیلە بینرخێنێ، ئەمە زۆر دوورە لە راستی و لە بنەماكانی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە.

بۆیە واتای كڕنووشبردن لێرەدا ئاماژەیە بەوەی كە پیاو وەكو هاوسەر لە چوارچێوەی خێزاندا، مافی زیاتری بەسەر خێزانەكەیەوە هەیە، بۆیە ناكرێت خێزانەكەی ئەو مافە لەیاد بكات.

**پێنجەم**: هاوشێوەی ئەم حوكم و فەرموودەیە بە روونی لە قورئاندا و لە سورەتی یوسفدا دەبینین كاتێك خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَرَفَعَ أَبَوَيْهِ عَلَى الْعَرْشِ وَخَرُّوا لَهُ سُجَّداً وَقَالَ يَا أَبَتِ هَذَا تَأْوِيلُ رُؤْيَايَ مِنْ قَبْلُ قَدْ جَعَلَهَا رَبِّي حَقّاً﴾[٦٧]. واتە: كاتێك باوك و دایك و براكانی یوسف چوون بۆ لای یوسف بۆ میسر، باوك و دایكی لە سەر كورسییەكە و لە جێگەی خۆی دانا، ئەوانیش كڕنووشیان بۆ یوسف برد و پاشان یوسف وتی: باوكە گیان ئەمە شرۆڤەی ئەو خەوە بوو كە كاتی خۆی بینیم و بۆم گێڕایتەوە، ئێستا خوای گەورە ئەو خەوەی كردە واقیع و راستی.

جا مەبەستم لێرەدا ئەوەیە كە كڕنووشبردنی یەعقوب و كوڕەكانی بۆ یوسف هەرگیز ئەوەی لێ ناخوێنرێتەوە كە ئەمان كڕنووشی بەندایەتیان بۆ یوسف بردبێت، بەڵكو موفەسرین دەفەرموون ئەمە وەكو رێزگرتنێك بوو لە یوسف، لە ئایینی ئەوانیشدا ئەم جۆرە كڕنووشبردنە بۆ رێزلێنان دروست بووە.

هەر بۆیە ئەو كڕنووشەیش كە پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەكەدا باسی دەكات مەبەست پێی رێز و پێزانینە و هیچی تر.

**شەشەم**: مەبەستی سەرەكی لەم فەرموودەیە بریتییە لە رێكخستنی ناو ماڵی موسڵمان و دیاریكردنی ئەرك و مافەكانی هاوسەرەكان بەسەر یەكترەوە، كە پیاو

---

٦٧ - سورة یوسف: الآیة: ١٠٠.

بەهۆی ئەوەی ئەرکی زیاترە لە ناو خێزاندا، هەر بۆیە مافیشی زیاترە، جا ئەم خاڵەیش خاڵێکی ڕێژەییە و ڕەها نییە و پەیوەستە بە ڕۆڵی ئەندامەکان لە چوارچێوەی خێزاندا، نەك بە ڕەگەزەکانیانەوە کە نێرن، یان مێ.

هەر بۆیە ئەگەر ئێمە وەك هاوسەر قسە لەسەر ئافرەت بکەین لە چوارچێوەی خێزاندا، ئەوە بەدڵنیاییەوە پیاو مافی زیاترە لەسەری.

بەڵام هەر هەمان ئافرەت ئەگەر وەك دایك قسەی لەسەر بکەین لە چوارچێوەی هەمان خێزاندا ئەوە سێ ئەوەندەی هاوسەرەکەی ماف و ڕێزی زیاترە بەسەر منداڵەکانییەوە. ئەگەر وەك خوشك قسەی لەسەر بکەین ئەوە هەمان ماف و ڕێزی براکەی هەیە. لە چەندین فەرموودەدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم جیاوازییەی زۆر ڕاشکاوانە ڕوون کردووەتەوە، بۆ نموونە دایکی باوەڕداران عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت: (سَأَلت النَّبِيَّ ﷺ: أيّ النَّاس أعْظَم حَقًا عَلَى الْمَرْأة؟ قَالَ: {زَوْجهَا} قُلْت: فَأيّ النَّاس أعْظَم حَقًّا عَلَى الرَّجُل؟ قَالَ: {أُمّه} ..)[٦٨]. واتە: لە پێغەمبەری خودام ﷺ پرسی کێ زۆر مافی لەسەر ئافرەت هەیە؟ فەرمووی: هاوسەرەکەی. وتم: ئەی کێ زۆر مافی بەسەر پیاوەوە هەیە؟ فەرمووی: دایکی.

جا بۆیە ئەم جۆرە هەڵوێست و فەرموودانە لە ئیسلامدا پەیوەندی بە ڕەگەزی تاکەکانەوە نییە، بەڵکو پەیوەندی بە ڕۆڵ و ئەرکەوە هەیە، کێ لەهەر بوارێکدا ئەرك و ڕۆڵی زیاتر و گرانترە مافیشی زیاترە.

هەر بۆیەیشە پێغەمبەری خودا ﷺ زۆر لێزانانە وشەکانی بەکار هێناوە کە دەفەرمووێت: ژن بەرامبەر بە هاوسەر و مێردەکەی، نافەرمووێت مێینە بەرامبەر بە نێرینە.

---

[٦٨] - النسائي- سنن النسائي الكبرى- ج٥/ص٣٦٣- كتاب (٧٩) عشرة النساء/ باب (٦٣) حق الرجل على المرأة- الحديث (٩١٤٨). الهيثمي- مجمع الزوائد- ج٤/ص٣٥٧- الحديث (٧٦٤٥).

**حەوتەم:** دیاریکردنی ئەم ئەرك و مافانە بەو شێوەیەی کە لە ئیسلامدا باسیان لێوە کراوە تەنیا پەیوەندییان بە رێکخستنی کاروبارەکانی دونیاوە هەیە و مەرج نییە لای خوا، یان بۆ قیامەت هەر وابێت، لەوانەیە ئەو پیاوەی کە دەڵێین ماف لە سەر ژنەکەی زیاترە، لای خوا ژنەکەی سەد ئەوەندەی پیاوەکەی بەڕێز و ئازیزتر بێت، ئەوەیش سەنگی مەحەکە و ڕێز و بەرزیی راستەقینە ئەوەیە کە لەلای پەروەردگار بێت بۆ ئەو ژیانە نەبڕاوەیە.

## فەرموودەی چوارەم:

{يَقْطَعُ الصَّلَاةَ الْمَرْأَةُ، وَالْحِمَارُ، وَالْكَلْبُ، وَيَقِي ذَلِكَ مِثْلُ مُؤْخِرَةِ الرَّحْلِ}[٦٩].

واتە: ژن و گوێدرێژ و سەگ نوێژ دەبڕن و بەتاڵی دەکەنەوە، بۆ خۆپاراستن لەمە با نوێژخوێن شتێك لە بەردەمیدا دابنێت کە بەرزییەکەی هێندەی ئەوە بێت کە بە کۆتایی کورتانی سەرپشتی وشترەوەیە –دیارە مەبەستی پێغەمبەر ﷺ دانانی سوترەیە لە کاتی نوێژکردندا–.

ئەمە یەکێکی دیکەیە لەو فەرموودانەی کە قسەی زۆری لەسەرە و راڤەی جیاوازی بۆ دەکرێت، بەر لەوەی تێبینییە تایبەتییەکان سەبارەت بەم فەرموودەیە بخەینە روو، دەمەوێت تێبینییەکی گشتیی هەیە بیخەینە روو بۆ ئەوەی بۆ ئەم فەرموودەیە و سەرجەم فەرموودە هاوشێوەکانی تریش سوودی لێ وەربگرین.

تێبینییەکەیش ئەوەیە کاتێك ئێمە قسە لە سەر دروستی (صحيح)، یان لاوازی (ضعيف)ی فەرموودەیەك دەکەین، دەبێت لە دوو لایەنەوە هەڵسەنگاندن و قسەی لەسەر بکەین.

---

[٦٩] - مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٥٩- كتاب (٥) الصلاة/ باب (٥٠) قدر ما يستر المصلي- الحديث (١١٦٧). الإمام أحمد- المسند- ج٣٤/ص١٨٢- الحديث (٢٠٥٧٢).

لایەنی یەکەم: بریتییە لە هەڵسەنگاندنی فەرموودەکە لە لایەنی ئەوەی کە ئەو فەرموودەیە چۆن بەدەستی ئێمە گەیشتووە، کێن ئەو کەسانەی کە گێڕاویانەتەوە و بە چەند رێگە گێڕدراوەتەوە، پاشان هەڵسەنگاندنی فەرموودەکە لەملایەنەوە تا چەند دروستە، یان کێشەی هەیە و لاوازە؟ ئەمەش شارەزایانی ئەم بوارە لە رێی هەندێك پێوەری تایبەتی خۆیانەوە ئەم جۆرە هەڵسەنگاندنە ئەنجام دەدەن و بڕیاری لەسەر دەدەن.

لایەنی دووەم: بریتییە لە هەڵسەنگاندنی فەرموودەکە لەلایەنی ئەوەی کە تاچەند مانا و واتای فەرموودەکە دروستە و لەگەڵ فەرموودەکانی تر یەك دەکاتەوە و لەگەڵ هێڵە گشتییەکانی شەرعدا دەگونجێ و ساز دەبێت.

چونکە فەرموودەمان هەیە هیچ کێشەی نییە لە لایەنی گێڕانەوە (سند)ی دا، بەڵام لە رووی ماناوە کێشەی هەیە، لەوانەیە ئەو کەسەی کە فەرموودەکەی گێڕاوەتەوە وەکو پێویست لێی تێنەگەیشتبێت، یان بۆی لەبەر نەکرابێت، یان حوکمی ئەو فەرموودەیەی ئەو بیستویەتی هەڵوەشێنرابێتەوە، بەڵام ئەو پێی نەزانیبێت، پاشان کە گێڕاویەتیەوە بەشێوەیەك گێڕاویەتیەوە هەڵەی تێ کەوتووە و یەکانگیر و دژ وەستاوەتەوە لەگەڵ هەندێك فەرموودەی تردا، بۆیە زانایانی فەرموودە گرنگییەکی تەواویشیان بەم لایەنە داوە و قسەی زۆریان لەسەر کردووە.

یەکەم کەس کە لەسەر ئەم بوارەی نوسیبێت لە زانایانی فەرموودە، پیاوێك بووە بە ناوی (أبو منصور) (عبد المحسن بن محمد بن علي البغدادي) (٤١١-٤٨٩هـ)، کە پەرتووکێکی نوسیووە تێیدا بیست و پێنج فەرموودەی هێناوە کە دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە (رەزا و رەحمەتی خوای لێ بێت) قسەی لەسەر کردوون، رەتی کردوونەتەوە، یان راستی کردوونەتەوە.

پاش ئەم، پیاوێکی تر هاتووە بە ناوی (أبو عبد الله) (بدر الدین الزرکشي) (٧٤٥-٧٩٤هـ) و لەسەر هەمان بوار پەرتووکێکی نووسیوە لەژێر ناوی (الإجابة

لایراد ما استدرکته عائشة علی الصحابة) کە بە شێوەیەکی فراوانتر قسەی لەسەر ئەو جۆرە فەرمودانە کردووە.

پاش ئەمان ئیمامی (سیوطي) هاتووە و ئەو فەرمودانەی کە دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) قسەی لەسەر کردووە و کۆی کردووەتەوە لە پەڕتوکێکدا و ناوی ناوە بە (عین الإجابة في استدراك عائشة علی الصحابة).

دیارە بابەتی ئەم پەڕتووکانەش کۆمەڵێك فەرموودەن کە هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ گێڕاویانەتەوە، بەڵام کە خاتوو عائیشە بیستویەتی ڕەتی کردۆتەوە، یان ڕەخنەی لێ گرتووە و ڕاستی کردووەتەوە.

بۆ نموونە کاتێك بیستویەتی کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ باس دەکات کە گوایە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: {إِنَّ الْمَيِّتَ لَيُعَذَّبُ بِبُكَاءِ أَهْلِه عَلَيْه}. واتە: مردوو بەوە سزا دەدرێت کە کەس و کارەکەی بەسەریدا دەگرین. ڕەخنەی لێ گرتووە و ڕاستی کردووەتەوە و وتویەتی نەخێر پێغەمبەری خودا ﷺ وای نەفەرموەە بەڵکو فەرمەویەتی: {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِه إِنَّهُمْ لَيَبْكُونَ عَلَيْه وَإِنَّهُ لَيُعَذَّبُ فِي قَبْرِه بِذَنْبِه}[70]. واتە: ئەو مردووە ئێستا سزا دەدرێت بەهۆی تاوان و سەرپێچیەکانییەوە و کەس و کارەکەیشی بۆی دەگرین.

فەرموودەکەیش بەو واتایەی کە خاتوو عائیشە دەیگێڕێتەوە دروستترە و گونجاوترە لەو شێوەیەی کە عەبدوڵڵای کوڕی عومەر باسی لێوە دەکات، چونکە لە شەرعی خوادا کەس بە تاوانی کەس سزا نادرێت، تاوانی مردوو نییە کە کەس و کارەکەی شین و گریان، یان هەر کارێکی ناشەرعی تری بۆ دەکەن.

---

70 - البخاري- صحيح البخاري- ج٤/ص١٤٦٢- كتاب (٦٧) المغازي/ باب (٧) قتل أبي جهل- الحديث (٣٧٥٩). مسلم- صحيح مسلم- ج٣/ص٤٤- كتاب (١٢) الجنائز/ باب (٩) الميت يعذب ببكاء أهله عليه- الحديث (٢١٩٧).

سەبارەت بە تێبینییە تایبەتیەکانیش لەسەر ئەم فەرموودەیە لەم چەند خاڵەدا کورتیان دەکەمەوە:

یەکەم: ئەم فەرموودەیە یەکێکە لەو فەرموودانەی کە لەگەڵ چەندین فەرموودەی دروستی تردا لەو بارەیەوە یەکانگیر و دژ دەوەستێتەوە، دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) کاتێك بیستویەتی زۆری پێ ناخۆش بووە و قسەی لەسەر کردووە و ڕوونکردنەوەی لەسەر داوە، تەنانەت گلەیی کردووە لەو کەسانەی کە گێڕاویانەتەوە و وایان بە گوێی خەڵکدا داوە کە گوایە ئافرەت و گوێدرێژ و سەگ نوێژ بەتاڵ دەکەنەوە. فەرمویەتی: {شَبَّهْتُمُونَا بِالْحُمُرِ وَالْكِلاَبِ، وَاللهِ لَقَدْ رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ يُصَلِّي وَإِنِّي عَلَى السَّرِيرِ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ مُضْطَجِعَةً، فَتَبْدُو لِي الْحَاجَةُ، فَأَكْرَهُ أَنْ أَجْلِسَ فَأُوذِيَ النَّبِيَّ ﷺ، فَأَنْسَلُّ مِنْ عِنْدِ رِجْلَيْهِ} [٧١]. واتە: ئێمەتان بە گوێدرێژ و سەگ چواندووە، وەڵاهی پێغەمبەری خوام ﷺ بینیوە نوێژی کردووە و منیش لەسەر جێگەکەی خۆم بووم و لە نێوان ئەو و قیبلەدا ڕاکشاوم، ئەگەر پێویستم بە شتێك بوایە پێم ناخۆش بوو هەستم و پێغەمبەری خوا ﷺ ئازار بدەم، بۆیە لە لای قاچەکانییەوە خۆم دەکێشایەوە و لە جێگەکەم دەهاتمە دەرەوە.

لە فەرموودەیەکی تردا خاتوو عائیشە دەفەرموێت: (كُنْتُ أَنَامُ بَيْنَ يَدَيْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَرِجْلاَى فِى قِبْلَتِهِ، فَإِذَا سَجَدَ غَمَزَنِى فَقَبَضْتُ رِجْلَىَّ، فَإِذَا قَامَ بَسَطْتُهُمَا، قَالَتْ: وَالْبُيُوتُ يَوْمَئِذٍ لَيْسَ فِيهَا مَصَابِيحُ) [٧٢]. واتە: لەبەردەم پێغەمبەری خوادا

---

[٧١] - البخاري- صحيح البخاري- ج١/ص١٩٢- كتاب (١٢) أبواب سترة المصلي/ باب (١٥) من قال لا يقطع الصلاة شيء- الحديث (٤٩٢). مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٦٠- كتاب (٥) الصلاة/باب (٥١) الإعتراض بين يدي المصلي- الحديث (١١٧١).

[٧٢] - البخاري- صحيح البخاري- ج١/ص١٩٢- كتاب (١٢) أبواب سترة المصلي/ باب (١٤) التطوع خلف المرأة- الحديث (٣٧٥). مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٦٠- كتاب (٥) الصلاة/باب (٥١) الإعتراض بين يدي المصلي - الحديث (١١٧٣).

ﷺ دەنووستم –دیارە مەبەستی ئەو کاتانەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ شەونوێژی تێدا دەکرد– قاچەکانم دەکەوتە بەردەم قیبلەکەی، ئەگەر بیویستایە کڕنووش ببات دەستێکی دەدا لە قاچمەوە و ئاگاداری دەکردمەوە و قاچەکانم هەڵدەکێشا، ئەگەر هەڵبسایەتەوە قاچەکانم درێژ دەکردەوە،ماڵەکانیش ئەو کاتە چرای تیانەبوو –تا پێغەمبەری خوا ﷺ قاچەکانی ببینێت–.

دیارە نووستنی خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێت) بەم شێوەیە لەبەر نوێژی پێغەمبەردا ﷺ لە ناچاریدا بووە، چونکە ژوورەکەیان هەر ئەوەندە بووە، ماڵەکانی پێغەمبەری خوا ﷺ هەموویان وا بوون.

لە فەرموودەیەکی تریشدا دەفەرموێت: {كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي صَلَاتَهُ مِنَ اللَّيْلِ، وَأَنَا مُعْتَرِضَةٌ بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْقِبْلَةِ كَاعْتِرَاضِ الْجِنَازَةِ}[٧٣]. واتە: پێغەمبەری خودا ﷺ شەونوێژی دەکرد و منیش لە بەینی ئەو و قیبلەدا وەکو جەنازە ڕادەکشام.

جا بۆیە خاتوو عائیشە پێی سەیرە چۆن دەبێت هاوەڵانی پێغەمبەر بەو شێوەیە لە فەرموودەیەك حاڵی بن کە گوایە ئافرەت نوێژ دەبڕێت و بەتاڵی دەکاتەوە! لە کاتێکدا پێغەمبەری خودا ﷺ خۆی بەم شێوەیە نوێژی کردووە و لە بەردەم قیبلەکەیدا ئافرەتێك ڕاکشاوە و نوێژەکەیشی نەبڕیوە.

دووەم: لە نێوان خێزانەکانی پێغەمبەردا تەنیا خاتوو عائیشە (ڕەزای خوای لێبێت) قسەی لەسەر ئەم فەرموودەیە نەکردووە، بەڵکو خێزانی تریشی هەبووە کە قسەی لەسەر کردووە، بۆ نموونە عەبدوڵڵای کوڕی شەداد دەڵێت: (حَدَّثَتْنِي

---

[٧٣] - البخاري- صحيح البخاري- ج١/ص١٥٠- كتاب (٩) أبواب الصلاة في الثياب/ باب (٢١) الصلاة على الفراش- الحديث (٣٧٦). مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٦٠- كتاب (٥) الصلاة/باب (٥١) الإعتراض بين يدي المصلي- الحديث (١١٦٨).

مَيْمُونَةُ زَوْجُ النَّبِى ﷺ قَالَتْ: {كَان رسُولُ اللّه ﷺ يُصَلِّى وَأَنَا حذَاءهُ، وَأنَا حَائِضٌ ورُبَّما أصابنى ثَوْبُهُ إذا سجد} [٧٤]

واته: خاتوو مەیمونەی خێزانی پێغەمبەری خوا ﷺ پێی وتم: پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد و منیش لە سووڕی مانگانەدا بووم و لە پاڵیدا بووم، هەندێکجار کە کڕنووشی ببردایە جلەکانی بەرم دەکەوت.

جا ئەگەر ئافرەت نوێژ ببڕێت ئایا چۆن ئەم لە پاڵ پێغەمبەری خوادا ﷺ بووە و لە سووڕی مانگانەشدا بووە لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژەکەیشی نەبڕیوە

تەنانەت ئیمامی بوخاری بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە، لە صەحیحەکەی خۆیدا بابێکی سەربەخۆ دێنێت لە ژێر ناونیشانی: (إذا صلى إلى فراش فيه حائض) [٧٥] واتە: ئەگەر نوێژخوێن نوێژی کرد ڕووەو جێگەیەك کە ئافرەتێکی حەیزداری تێدا بوو. ئیبن حەجەری عەسقەلانی کاتێك دەست بە راڤەکردنی ئەم بابەی صەحیحی بوخاری دەکات دەفەرموێت: (أي هل يكره أو لا؟ وحديث الباب يدل على أن لاكراهة) [٧٦] واتە: ئایا باش نییە نوێژ بکرێت ڕووەو جێگەیەك ئافرەتێکی حەیزداری تێدا بێت، یان دروستە و هیچ کێشەی نییە؟ ئەم فەرموودەیە -دیارە مەبەستی ئەو فەرموودەیەیە کە خاتوو مەیمونە ریوایەتی دەکات- بەڵگەیە لە سەر ئەوەی کە دروستە و هیچ کێشەی نییە.

---

[٧٤] البخاري- صحيح البخاري- ج١/ص١٩٣- كتاب (١٢) أبواب سترة المصلي/ باب (١٧) إذا صلى إلى فراش فيه حائض الحديث (٤٩٥-٤٩٦). مسلم- صحيح مسلم- ج٢/ص٦١- كتاب (٥) الصلاة/باب (٥١) الإعتراض بين يدي المصلي- الحديث (١١٧٤).

[٧٥] البخاري- صحيح البخاري- ج١/ص١٩٣- كتاب (١٢) أبواب سترة المصلي/ باب (١٧) إذا صلى إلى فراش فيه حائض.

[٧٦] إبن الحجر فتح الباري شرح صحيح البخاري- ج١/ص٥٩٣.

هەروەها ئیمامی بەیهەقییش بابێکی تەواوی لە سونەنەکەی خۆیدا لەسەر ئەو بابەتە هێناوە لە ژێر ناونیشانی (الدلیل علی أن مرور المرأة بین یدیە لا یفسد الصلاة)[77]. واتە: بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ڕۆیشتنی ئافرەت بە بەردەم نوێژدا نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

سێیەم: ئەم فەرموودەیە نەك تەنیا لەگەڵ لێکدانەوە و حەدیسەکانی خێزانەکانی پێغەمبەردا ﷺ یەك ناکاتەوە، بەڵکو لەگەڵ لێکدانەوەی زۆرێك لە هاوەڵانیش یەك ناکاتەوە، لە نێوانیشیاندا:

- عەبدوڵڵای کوڕی عەباس (ڕەزای خوایان لێ بێت) دەفەرموێت: {جِئْتُ أَنَا وَالْفَضْلُ بْنُ الْعَبَّاسِ يَوْمَ عَرَفَةَ، وَرَسُولُ اللَّهِ ﷺ يُصَلِّي بِالنَّاسِ، وَنَحْنُ عَلَى أَتَانٍ لَنَا، فَمَرَرْنَا بِبَعْضِ الصَّفِّ فَنَزَلْنَا عَنْهَا، وَتَرَكْنَاهَا تَرْتَعُ، وَلَمْ يَقُلْ لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ شَيْئًا}[78]. واتە: من و فەزڵی کوڕی عەباس گوێدرێژێکی مێینەمان پێبوو، ڕۆژی عەرەفە کە هاتین پێغەمبەری خوا ﷺ نوێژی دەکرد، بەپێش نوێژەکەدا هاتین هەندێك لە ڕیزی نوێژەکەمان تێپەڕاند، پاشان لە گوێدرێژەکە دابەزین و گوێدرێژەکەمان واز لێ هێنا تا بلەوەڕێت، پاشانیش پێغەمبەری خوا ﷺ هیچی پێ نەوتین.

جا دیارە مەبەستی عەبدوڵڵای کوڕی عەباسیش لە گێڕانەوەی ئەم فەرموودەیە وەڵامدانەوەی ئەو فەرموودەیەیە کە گوایە گوێدرێژ نوێژ دەبڕێت، بۆیە دەڵێت: پێغەمبەری خوا ﷺ نەیوت بۆ ئەو کارەتان کرد؟ یان بۆ بەبەر نوێژەکەدا هاتن؟

---

[77] - البيهقي- سنن البيهقي الكبرى- ج٢/ص٢٧٥- باب (٣٩٤) الدليل على أن مرور المرأة بين يديه لا يفسد الصلاة.

[78] - إبن خزيمة- صحيح إبن خزيمة- ج٢/ص٢٢- الحديث (٨٣٣). النسائي- سنن النسائي الكبرى- ج١/ص٢٧٢- الحديث (٨٢٨). البيهقي- سنن البيهقي الكبرى- ج٢/ص٢٧٦- كتاب (٢) الحيض/ باب (٣٩٥) الدليل على أن مرور الحمار بين يديه لا يفسد الصلاة- الحديث (٣٣١٤). الترمذي- سنن الترمذي- ج٢/ص١٦٠- أبواب الطهارة/ باب (٢٥٢) ما جاء لا يقطع الصلاة شيء- الحديث (٣٣٧)- وقال الألباني: حديث صحيح.

یان نوێژەکەی نەگێڕایەوە، کەواتە نەك ئافرەت تەنانەت گوێدرێژیش نوێژ بەتاڵ ناکاتەوە.

ئیمامی ترمزییش لە پاشکۆی ئەم فەرموودەیەدا دەفەرموێت: (وحديث ابن عباس حديث حسن صحيح، والعمل عليه عند أكثر أهل العلم من أصحاب النبي ﷺ، ومن بعدهم من التابعين قالوا: لا يقطع الصلاة شيء)[79]. واتە: فەرموودەکەی عەبدوڵڵای کوڕی عەباس دروستە و زۆربەی زانایان لە هاوەڵانی پێغەمبەر و شوێنکەوتوانیشیان کاریان پێکردووە و وتویانە: کە هیچ شتێك نوێژ نابڕێت.

– هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش (ڕەزای خوایان لێ بێت) وەڵامی ئەو جۆرە تێگەیشتنەی لەو فەرموودەیە داوەتەوە و پێی پەسەند نەبووە، سالم دەگێڕێتەوە و دەڵێت: (قِيلَ لابْنِ عُمَرَ: إِنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَيَّاشِ بْنِ أَبِي رَبِيعَةَ يَقُولُ: يَقْطَعُ الصَّلاَةَ الْكَلْبُ وَالْحِمَارُ. فَقَالَ ابْنُ عُمَرَ: لاَ يَقْطَعُ صَلاَةَ الْمُسْلِمِ شَيْءٌ)[80]. واتە: بە عەبدوڵڵای کوڕی عومەریان گوت: عەبدوڵڵای کوڕی عەیاشی کوڕی ڕەبیعە دەڵێت: سەگ و گوێدرێژ نوێژ دەبڕن و بەتاڵی دەکەنەوە. عەبدوڵڵای کوڕی عومەریش فەرمووی: هیچ شتێك نوێژی موسڵمان نابڕێ و بەتاڵی ناکاتەوە.

– زۆرێکی تر لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ڕەزای خوایان لێ بێت)، ئەم جۆرە بۆچوون و لێکدانەوەیەیان ڕەت کردووەتەوە، لەوانە: هەر سێ جێنشینەکەی پێغەمبەری خوا ﷺ ئەبوبەکری صدیق، عوسمانی کوڕی عەفان، عەلی کوڕی ئەبی تالیب، (ڕەزای خوایان لێ بێت)، زۆێکی تریش کە لەبەر کەمی جێگە ناوەکانیان نابەین.

هەروەها هەر چوار پێشەوا و سەر مەزهەبەکانی فیقهی ئیسلامییش (ئەبو حەنیفە، مالیك، شافیعی و ئەحمەد) بەکۆی دەنگ ئەم جۆرە راڤەکردنەیان بۆ فەرموودەکە ڕەت کردووەتەوە، (موبارەکفوری) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: (وقال

---

[79] - الترمذي- سنن الترمذي- ج٢/ص١٦٠.

[80] - البيهقي- سنن البيهقي الكبرى- ج٢/ص٢٧٨.

مالك وأبو حنيفة والشافعي (رضي الله عنهم)، وجمهور من السلف والخلف لا تبطل الصلاة بمرور شيء من هؤلاء)[٨١]. واته: ئیمامی مالیك و ئەبوحەنیفە و شافعییش (رەزای خوایان لێبێت)، هەروەها زۆرینەی زانایانی پێشین و پاشینیش وتویانە: هیچ کام لەو شتانە –ئافرەت، سەگ، گوێدرێژ– نوێژ بەتاڵ ناکەنەوە.

**چوارەم:** سەبارەت بە لێکدانەوەی زانایان بۆ فەرموودەکە چەند بۆچونێك هەیە دیارترینیان دوانە:

یەکەمیان: هەندێك لە زانایان پێیانوایە کە حوکمی ئەم فەرموودەیە –مەبەستمان ئەو فەرموودەیەیە کە قسەی لە سەر دەکەین– سڕدراوەتەوە و هەڵوەشاوەتەوە و کاری پێ ناکرێت (منسوخ)ە، بە بەڵگەی ئەو هەموو فەرموودانەی کە دژی دەوەستنەوە و لەگەڵی یەك ناکەنەوە، بەڵام ئەم بۆچوونە زۆر پەسەند نییە، لە بەر چەند هۆیەك:

أ- لە بەر ئەوەی (نسخ) پێویستی بەوەیە کە مێژووی هاتنی هەردوو حوکم و فەرموودەکە بزانیت تا بتوانیت بڵێیت فەرموودەی پاشتر ئەوەی پێش خۆی سڕیوەتەوە و هەڵوەشاندووەتەوە، لێرەشدا مێژووی هاتنی فەرموودەکان دیار نین، بۆیە ناتوانین بڕیاری نەسخ بدەین.

ب - لەبەر ئەوەی بڕیاری (نسخ) دوا بڕیارە بۆ چارەسەرکردنی دژوەستانەوەی دوو فەرموودە لەگەڵ یەکتر، بەڵام لێرەدا دەکرێت چارەسەری ئەو دژیی و گرژییە بکرێت بە رێگەی ئاسانتر بۆیە بڕیاری نەسخ نادرێت.

دووەمیان: کە ئەمەیان پەسەندتر و گونجاوترە و بۆچوونی زۆربەی زانایانی لە سەرە، ئەوەیە: کە ئەم فەرموودانە هەمووی راستن و کاریشیان پێ دەکرێت.

بەڵام لێکدانەوەی دروست بۆیان ئەوەیە کە مەبەست لەو فەرموودەیە ئەوەنییە کە رۆیشتنی ئافرەت بە بەردەم نوێژخوێندا نوێژەکەی ببڕێت، یان بەتاڵی

---

[٨١] - المباركفوري- تحفة الأحوذي- ج٢/ص٢٥٩.

بکاتەوە، بەڵکو مەبەست پێی ئەوەیە کە ئافرەت هەمیشە جێی سەرنجی پیاوە، جا ئەگەر بەبەر نوێژەکەیدا بڕوات ئەوا لەوانەیە سەرنجی بەلای خۆیدا رابکێشێت و کەم تا زۆر ئاگای لە نوێژەکەی نەمێنێت و بەمەش پاداشتی نوێژەکەی کەم دەکاتەوە، کەواتە مەبەست لە (قطع) لە فەرموودەکەدا بڕینی شێوە تەواوەکەیەتی (نفي الكمال)، نەك بەتاڵکردنەوە (نفي الصحة).

بەمەش دەتوانین هەموو فەرموودەکان و واتاکانیان کۆ بکەینەوە، چونکە هەموو ئەو فەرموودانەی کە خێزانەکانی پێغەمبەر (رەزای خوایان لێ بێت) گێڕاویانەتەوە باس لەوە دەکەن کە ئەمان لەو کاتەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی کردووە نوستوون و خۆیان داپۆشیوە، لە هیچ فەرموودەیەکدا نەهاتووە کە بە بەردەم نوێژەکەدا هاتبن یان چووبن.

ئەم حوکمەیش تایبەت نییە بە ئافرەتانەوە، بەڵکو گشتگیرە بۆ هەموو نوێژێك و هەموو نوێژخوێنێك، کە پێویستە هەموو نوێژخوێنێك کە نوێژی کرد سوترە دابنێت لە کاتی نوێژەکەیدا و چاو ببڕێتە ئەو شوێنەی کە ناوچاوانی لەسەر دادەنێت، چاو بەملاولادا نەگێڕێت و پێویستیشە کەس بە نێوانی ئەم و سوترەکەیدا تێپەڕ نەبێت و نەڕوات.

هەرکات نوێژخوێن پیاو بێت، یان ئافرەت لە نوێژەکەیدا سوترەی دانەنا و شتێکی سەرنجراکێش بەبەردەمیدا تێپەڕی، یان چاوی گێڕاو شتێکی سەرنجڕاکێشی بینی جا پیاو ئافرەت ببینێت، یان ئافرەت پیاو ببینێت، ئەوا پاداشتی نوێژەکەیان کەم دەبێتەوە.

لەم حوکمەشدا هیچ جیاوازییەك لە نێوان پیاو و ئافرەتدا نییە، حوکمەکەیش تایبەت نییە بە ئافرەتانەوە، بەمەش واتاو حوکمی هەموو فەرموودەکان یەك دەگرنەوە و روون دەبنەوە.

**فەرموودەی پێنجەم:**

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {لاَ عَدوى، وَلاَ طِيَرَةَ، وَإِنَّمَا الشُّؤْمُ فِي ثَلاَثَةٍ: الْمَرْأَةِ، وَالْفَرَسِ، وَالدَّارِ} [٨٢].

واتە هیچ نەخۆشی و پەتایەك لە كەسێكەوە ناگوازرێتەوە بۆ كەسێكی تر، هیچ شتێك نابێتە مایەی نەگبەتی و بەدبەختی مرۆڤ، نەگبەتی و شومی تەنیا لە سێ شتدا هەیە، لە: ئافرەت، ئەسپ و خانوودا.

لە ریوایەتێكی تری فەرموودەكەدا هاتووە كە: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: {إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِي شَيْءٍ، فَفِي الْفَرَسِ، وَالْمَسْكَنِ، وَالْمَرْأَةِ} [٨٣]. واتە ئەگەر نەگبەتی و شوومی لە شتێكدا هەبێت، ئەوە لە: ئەسپ، خانوو و ئافرەتدایە.

لێرەدا و بەر لەوەی تێبینییەكان لەسەر فەرموودەكان بخەینە روو، هەندێ وشەی نامۆ لە فەرموودەكاندا بەكار هاتوون راڤەیان دەكەین، تا خوێنەر لێیان بەئاگا بێت، چونكە زۆر بەكاریان دەهێنین، حوكمە شەرعییەكانیش پەیوەستن بەو وشانەوە، وشەكانیش:

لاَ عَدوى: واتە هیچ نەخۆشی و پەتایەك لە كەسێكەوە ناگوازرێتەوە بۆ كەسێكی تر، مەبەستی فەرموودەكە لێرەدا قسەكردنە لە سەر لایەنی دەروونی و باوەڕی مرۆڤی باوەڕدار، بەوەی كە دەبێت مرۆڤی باوەڕدار دەروونی ئارام و دڵنیا بێت و باوەڕی وابێت بەوەی كە هەرچی ویستی خوای لەسەر نەبێت نابێت، هیچ

---

[٨٢] - البخاري- صحيح البخاري- ج٥/ص٢١٧١- كتاب (٧٩) الطب/ باب (٤٢) الطيرة/ الحديث (٥٤٢١). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص٣٤- كتاب (٤٠) السلام/ باب (٣٤) الطيرة والفأل وما يكون فيه الشؤم- الحديث (٥٩٣٨).

[٨٣] - البخاري- صحيح البخاري- ج٥/ص١٩٥٩- كتاب (٧٠) النكاح/ باب (١٨) ما يتقى من شؤم المرأة/ الحديث (٤٨٠٦). مسلم- صحيح مسلم- ج٧/ص٤ كتاب (٤٠) السلام/ باب (٣٤) الطيرة والفأل وما يكون فيه الشؤم- الحديث (٥٩٣٨).

نەخۆشییەکیش بێ ویستی خوا ناگوازرێتەوە و تووشی کەس نابێت، ئەوەیش کە ویستی خوای لەسەر بێت گەڕانەوە و ڕەتبوونەوەی نییە.

دیارە ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە مرۆڤ خۆی لەو نەخۆش و نەخۆشییانە نەپارێزێت کە ئەگەری گواستنەوەیان لێدەکرێت، چونکە لە بەرامبەر ئەم فەرموودەیەدا چەندین فەرموودەی ترمان هەیە قسە لەسەر لایەنە مادی و بەرجەستەییەکان دەکەن، بەوەی کە پێویستە مرۆڤی باوەڕدار هەموو ئەو ڕێگانە بگرێتە بەر کە لە نەخۆشی و شتی زیانبەخش و خراپ دووری دەخەنەوە، هەروەها دەبێت خۆی لەو نەخۆش و نەخۆشییانەیش بپارێزێت کە دەگوازرێنەوە، یان نەچێتە ناو خاکێك، یان خەڵکێك کە نەخۆشییەك، یان پەتایەکی تێیدا بڵاوە تا ئەم توشی نەیەت.

لە دەرەنجامی کۆکردنەوە و کارکردن بە هەموو فەرموودەکان دەگەینە ئەوەی کە دەبێت مرۆڤی باوەڕدار خۆی لە هەموو ئەو شتانە بەدوور بگرێت کە ئەگەری زیان، یان نەخۆشییان لێ دەکرێت، هەر کاتێکیش توشی نەخۆشی، یان ناڕەحتییەك هات دەبێت باوەڕی وابێت کە ئەو نەخۆشییە لەلایەن خواوەیە و ویستی خوای لە سەرە و نابێ بڵێت فلان کەس، یان فلان شت توشی کردم.

طِيَرَة: کاتی خۆی عەرەب عادەتیان وابوو ئەگەر بیانویستایە سەفەرێك بکەن، یان کارێکی گرنگ ئەنجام بدەن، بەلای باڵندەیەکی نیشتوودا دەڕۆیشتن و هەڵیان دەفڕاند، جا ئەگەر باڵندەکە بە لای چەپدا بفڕیایە ئەوە سەفەرەکە، یان کارەکەیان واز لێ دەهێنا و نەیاندەکرد، بەڵام ئەگەر باڵندەکە بەلای ڕاستدا بفڕیایە ئەوە سەفەرەکە، یان کارەکەیان دەکرد، ئەم جۆرە بیروباوەڕە زۆربەی کات پەکی کارەکانی دەخستن و نەیاندەکرد.

پاشتر ئەم زاراوەیە شێوەیەکی گشتگیرتری وەرگرتووە و بە هەموو ئەو شتانە وتراوە کە مرۆڤ بە چاوی نەگبەتی، یان شوومی سەیریان بکات، جا کاتێك ئیسلام

هاتووه ئەمانەی هەموو هەڵوەشاندووەتەوە، پێغەمبەری خوداش ﷺ لێرەدا باس لە بنەبڕکردن و نەهێشتنی ئەم خووە خراپانەی عەرەب دەکات.

شُؤْمُ: بە واتای خراپە و زیان و نەگبەتی بەکار دێت.

هەرکەس سەیری رووکەشی ئەم فەرموودانە بکات و بیەوێت سەرپێیی راڤەیان بکات لەوانەیە بکەوێتە هەڵەوە و بە پێچەوانەی مەبەستی فەرموودەکانەوە راڤەیان بۆ بکات.

چونکە رووکەشی فەرموودەکان ئەوە دەگەیەنن کە ئافرەت یەکێکە لەو شتانەی کە دەکرێت ببێتە مایەی شوومی و نەگبەتی و بەدبەختی مرۆڤ، جا لێرەدا و بۆ رێگرتن لەمجۆرە خوێندنەوە و تێگەیشتنە و بۆ لابردنی ئەو جۆرە گومان و ئاڵۆزییانە دەربارەی ئافرەت ئەم چەند تێبینییە دەخەینە روو:

یەکەم: ئەو جۆرە راڤەکردنە سەرپێییە لە خودی فەرموودەکان خۆیاندا توشی کێشە و ئاڵۆزییمان دەکەن، چونکە سەرەتای ئەم فەرموودەیە بەوە دەست پێ دەکات کە (لَا طِيَرَةَ). واتە: هیچ شتێك نییە ببێتە مایەی نەگبەتی و شوومی بۆ مرۆڤ، پاشانیش دەفەرموێت: نەگبەتی و شوومی تەنیا لە سێ شتدا هەیە.

باشە ئایا دەگونجێت سەرەتای فەرموودەیەك باس لە نەفی و نەبوونی شتێك بکات، پاشان کۆتاییەکەی سەرەتاکەی هەڵبووەشێنێتەوە و دژی بووەستێتەوە؟.

ئەمە جگە لەوەی کە ئەم جۆرە راڤەکردنە تووشی ئاڵۆزی و رووبەڕووبوونەوەمان دەکات لەگەڵ چەندین فەرموودەی دروست (صحيح)ی تردا، لەوانە:

- پێغەمبەری خودا ﷺ دەفەرموێت: {الطِّيَرَةُ شِرْك، الطِّيرةُ شرك، الطِّيَرَةُ شِرْك (ثلاثا)..ولكنَّ اللّه يُذهبُه بالتوكل}[٨٤]. واتە: ناوزەدکردنی شتێك بەوەی کە مایەی

---

٨٤ - أبو داود- سنن أبي داود- ج٢/ص٤٠٩- كتاب (٢٩) الطب/ باب (٢٤) في الطيرة- الحديث (٣٩١٠)- وقال الألباني: حديث صحيح. إبن ماجة- سنن إبن ماجة- ج٢/ص١١٧٠- كتاب (٣١) الطب/ باب (٤٣) باب من كان يعجبه الفأل ويكره الطيرة- الحديث (٣٥٣٨).

نەگبەتییە، یان بەدبەختییە و زیان بە مرۆڤ دەگەیەنێت، شیرکە، پێغەمبەری خودا ﷺ سێ جار ئەمەی دووبارە کردەوە، پاشان فەرمووی: پشت بە خوابەستن ئەو جۆرە گومان و باوەڕانە دەڕەوێنێتەوە.

ـ هەروەها پێغەمبەری خودا ﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {مَنْ رَدَّتْهُ الطِّيَرَةُ مِنْ حَاجَةٍ فَقَدْ أَشْرَكَ} قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا كَفَّارَةُ ذَلِكَ؟ قَالَ: {أَنْ يَقُولَ أَحَدُهُمْ: اللَّهُمَّ لاَ خَيْرَ إِلاَّ خَيْرُكَ، وَلاَ طَيْرَ إِلاَّ طَيْرُكَ، وَلاَ إِلَهَ غَيْرُكَ}[٨٥]. واتە: هەر کەسێك بە شووم سەیرکردنی کارێك وای لێ بکات واز لەو کارەی بهێنێت، ئەوە وەك ئەوەیە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دابێت –دیارە ئەمەش بە هۆی ئەوەوەیە کە سوود و زیان تەنیا بە دەستی خوایە و بەڵام ئەم وا سەیری ئەو شتەی کردووە کە دەتوانێت زیان، یان سوودی پێ بگەیەنێت، بۆیە ئەم بۆچوونەی وەك ئەوە وایە کە هاوەڵی بۆ خوا بڕیار دابێت– پاشان هاوەڵەکانی پرسیاریان کرد، چی ئەم تاوانە دەسڕێتەوە؟ فەرمووی: با ئەو کەسە بڵێت: خوایە هیچ سوودێك نییە مەگەر ئەوە نەبێت کە لای تۆوە دێت، هیچ نەهامەتی و نەگبەتیەکیش نییە و نابێت مەگەر ئەوە نەبێت کە لە لای تۆوە دێت، هیچ پەرستراوێکیش بە حەق نییە جگە لە زاتی تۆ.

کەواتە لەم فەرموودەیەشدا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەم جۆرە بۆچوونە بە شیرك و بێباوەڕی لە قەڵەم دەدات، جا ئایا چۆن دەگونجێت ئەو خۆی ئافرەت بە مایەی نەگبەتی و شوومی لە قەڵەم بدات و سەیر بکات؟.

لێرەدا حەز دەکەم دەقێکی (شێخ تەقیەددین سوبوکی)تان عەرز بکەم کە لە راڤەی ئەم فەرمودانەدا دەفەرموێت: (إشارة إلى تخصيص الشؤم بالمرأة التي تحصل منها العداوة والفتنة، لا كما يفهمه بعض الناس من التشاؤم بكعبها، وإن لها تأثيرا في ذلك وهو شيء لا يقول به أحد من العلماء، ومن قال ذلك فهو جاهل، وقد

---

٨٥ - الإمام أحمد- المسند- ج١١/ص٦٢٣- الحديث (٧٠٤٥). حسنه الأرناؤوط وصححه الألباني في صحيح الجامع برقم ٦٢٦٤.

أطلق الشارع على من نسب المطر إلى النوء الكفر، فكيف من نسب ما يقع من الشر إلى المرأة)[86].

واتە: ئەم فەرموودانە ئاماژەن بە تایبەتکردنی شوومی و نەگبەتی بەو ئافرەتانەی کە دەبنە مایەی ئەوەی بەهۆی کردەوە خراپەکانیانەوە، نەك وەکو ئەوەی کە خەڵکانێك تێی دەگەن کە خودی ئافرەتەکە ببێتە مایەی شوومی و نەگبەتی، یان خودی ئافرەت کاریگەری هەبێت لەسەر ئەوە، هیچ زانایەکیش ئەوەی نەوتووە، هەرکەس ئەوە بڵێت ئەوە نەزانە، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ ئەو کەسەی بە کافر و بێباوەڕ لە قەڵەم داوە کە دەڵێت: فلان ئەستێرە بارانمان بۆ دەبارێنێت و مایەی خێرە، ئەی دەبێت حاڵی ئەوانە چۆن بێت کە هەرچی خراپەیەك روو دەدات دەیدەنە پاڵ ئافرەت و دەڵێن: مایەی شەڕە.

دووەم: بەدەر لەوەی کە ئەم جۆرە راڤەکردنە کێشە و ئاڵۆزییمان بۆ دروست دەکەن لەگەڵ فەرموودەکاندا، بە هەمان شێوە لەگەڵ خودی قورئانیش ئاڵۆزی دروست دەکات، چونکە هەمیشە قورئان ئەو جۆرە بیر و باوەڕە بەد و گوماناوییانەی داوەتە پاڵ بێباوەڕان، هەمیشە خەڵکی بێباوەڕ تۆمەتی نەگبەتی و شوومییان داوەتە پاڵ خەڵکی باوەڕدار و پێغەمبەران، وەك چۆن خوای گەورە لە چەند ئایەتێکدا ئاماژەی پێدەکات و دەفەرموێت: ﴿فَإِذَا جَاءَتْهُمُ الْحَسَنَةُ قَالُوا لَنَا هَذِهِ وَإِنْ تُصِبْهُمْ سَيِّئَةٌ يَطَّيَّرُوا بِمُوسَى وَمَنْ مَعَهُ أَلا إِنَّمَا طَائِرُهُمْ عِنْدَ اللَّهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَهُمْ لا يَعْلَمُونَ﴾[87]. ئەم ئایەتە تابلۆیەکە لە بێباوەڕی گەلەکەی موسا (سەلامی خوای لەسەر بێت)، کە ئەگەر تووشی خێر و خۆشییەك بهاتنایە دەیانوت: ئەوە هی چاکی ئێمەیە، دیارە شان و باڵمان هەڵی دەگرێت، بەڵام ئەگەر تووشی ناخۆشی، یان زیانێك بهاتنایە، دەیانوت ئەمە هەمووی هی شومی و نەگبەتی موسا و شوێنکەوتووەکانێتی ئێمەیشی گرتووەتەوە، خوای پەروەردگار وەڵامی ئەو

---

[86] - إبن الحجر- فتح الباري- ج٩/ص١٣٨.

[87] - سورة الأعراف: الآية: ١٣١.

بێباوەڕییەیان دەداتەوە و دەفەرموێت: هەموو ئەو نەگبەتی و زیانانەی کە توشیان دەبێت لە لای خواوەیە و بە هۆی کردەوەی بەدی خۆیانەوەیە، بەلاَم زۆرێکیان نەفامن و تیَ ناگەن.

یان لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: ﴿قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَنْ مَعَكَ قَالَ طَائِرُكُمْ عِنْدَ اللَّهِ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ﴾(٨٨).

ئەم ئایەتەیش دیمەنێکە لە گفتوگۆی گەلی (ثمود) لەگەلَ (صالح) پێغەمبەر (سەلامی خوای لیَ بێت)، کاتێك تۆمەتباریان دەکرد و پێیان دەوت: تۆ و شوێنکەوتوانت بوونەتە مایەی شوومی و نەگبەتی بۆ ئێمە -دیارە ئەمانیش لە سزای بێباوەڕییەکەیاندا خوای بالاَدەست تووشی قات و قڕی و ناڕەحەتی کردبوون- صالحیش (سەلامی خوای لیَ بێت) پێی دەگوتن، هەرچی بەلاَ و نەگبەتیتان بەسەر دێت لە لای خواوەیە، خوا تاقیتان دەکاتەوە، هیچ تاوان، یان دەسەلاَتی ئێمەی تێدا نییە.

هەروەها لە سورەتی یاسیندا دەفەرموێت: ﴿قَالُوا إِنَّا تَطَيَّرْنَا بِكُمْ لَئِنْ لَمْ تَنْتَهُوا لَنَرْجُمَنَّكُمْ وَلَيَمَسَّنَّكُمْ مِنَّا عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾(٨٩). ئەمەش دیسانەوە دیمەنی گفتوگۆی گەلێکی بێباوەڕە لەگەلَ پێغەمبەرەکانیان، کە بە پێغەمبەرەکانیان دەگوت: ئێوە بوونەتە مایەی شوومی و نەگبەتی بۆ ئێمە، ئەویش بەهۆی ئەوەی کە خوا لە سزای بێباوەڕی و کەللە رەقییاندا کۆمەلێك دەرد و ناڕەحەتی بۆ ناردبوون تا بیر بکەنەوە و بگەڕێنەوە، بەلاَم ئەوان بە پێچەوانەوە زیاتر گومڕا دەبوون و بە پێغەمبەرەکانیان دەگوت: هی نەگبەتی و شوومی ئێوەیە ئێمە ئەمانەمان بەسەر دێت، ئەگەر ئێوە دەست لەم بیر و بانگەوازە هەلنەگرن دەتانکوژین و تووشی سزای سەخت و دژوارتان دەکەین.

---

٨٨ - سورة النمل: الآية: ٤٧.

٨٩ - سورة يس: الآية: ١٨.

**کەواتە وەك دەبینین هەمیشە خەڵكی بێباوەڕ ئەو جۆرە گومان و ڕەشبینییانەیان هەبووە بەرامبەر خەڵكانی تر، ئەم جۆرە بیركردنەوانە دوورن لە خەڵكی باوەڕدارەوە، چونكە خەڵكی باوەڕدار هەمیشە پێی وایە كە خودی مرۆڤ نابێتە مایەی نەگبەتی، یان شوومی و حەرامیشە وا سەیری كەس بكرێت، بەڵام دەكرێت مرۆڤ بەهۆی كردەوەی بەدی خۆیەوە توشی ناڕەحەتی و نەگبەتی بێت، بەدەر لە خوای باڵادەست هیچ كەسی تر توانای ئەوەی نییە كە سوود، یان زیان بە مرۆڤەكان بگەیەنێت.**

**جا ئایا دەگونجێت پێغەمبەری ئیسلام ﷺ بێت و ئەم كولتوورە بەد و خراپەی میللەتانی بێباوەڕ لەناو موسڵماناندا زیندوو بكاتەوە، ڕەگەزێكی سەرەكی ژیان و بوونەوەر بكاتە مایەی نەگبەتی و شوومی؟ شتی وا قەت نەگونجاوە و نابێت.**

**سێیەم: مەبەستی سەرەكی لەم فەرموودانەی پێغەمبەر ﷺ ڕەواندنەوە و لابردنی ئەو بیر و بۆچوون و گومانانەیە كە لەوانەیە لە ناخی هەندێك لە هاوەڵانیدا مابێت لە پاشماوەكانی سەردەمی نەفامی و سڕینەوەی ئەو دابونەریتانەیە كە لەگەڵ ئیسلام یەك ناگرنەوە و ڕاستكردنەوەی هەندێك چەمكی بیروباوەڕە لە ناو موسڵماناندا.**

**هەر بۆیەشە ئەو زاراوانەی كە لە فەرموودەكاندا هاتوون لە نموونەی (عَدوی[٩٠]، طِیَرَة[٩١]، هَامَـة[٩٢]، صَفَر[٩٣]، نَوْء[٩٤]، غُـول[٩٥]) كۆمەڵێك زاراوەن لە**

---

٩٠ - عَدْوَى: واتە هیچ نەخۆشی و پەتایەك لە كەسێكەوە ناگوازرێتەوە بۆ كەسێكی تر.

٩١ - طِیَرَة: بە شێوەیەكی گشتیی بە هەموو ئەو شتانە وتراوە و دەوترێت كە مرۆڤ بە چاوی نەگبەتی یان شومی سەیریان بكات.

٩٢ - هَامَة: ئەمەش دیسانەوە خویەكی تری خراپی ناو كۆمەڵگای نەفامی بوو كە بڕوایان وابوو كاتێك كەسێكیان لێ دەكوژرێت، شتێك لەلای سەریەوە لە قەبرەكەیەوە دێتە دەرەوە و بەردەوام هاوار دەكات دەڵێت تینوومە تینوێتیم بشكێنن، هەتا بكوژەكەی نەكوژنەوە بەردەوام هەر وا دەبێت و وا دەڵێت،

**سەردەمی نەفامییدا باو بوون و زۆر حیسابیان بۆ کراوە و زۆر بەرز نرخێنراون، بەڵام لە ئیسلامدا هیچ بایەخ و نرخێکیان نییە و پێغەمبەری خوا ﷺ دەیەوێت هاوەڵەکانی لێ ئاگادار بکاتەوە و راستیی بابەتەکانیان بۆ روون بکاتەوە.**

**چوارەم:** ئەم فەرموودەیەیش دیسانەوە یەکێکی ترە لەو فەرموودانەی کە دایکی باوەڕداران خاتوو عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) بە توندی رەخنەی لە شێوازی گێڕانەوەکەی گرتووە و تێیدا گلەیی لە ئەبوهورەیرە کردووە کە فەرموودەکەی بەو شێوەیە گێڕاوەتەوە، لەمبارەیەوە ئیمامی ئەحمەد دەقێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (أَنَّ رَجُلَيْنِ مِنْ بَنِي عَامِرٍ دَخَلاَ عَلَى عَائِشَةَ فَقَالاَ: إِنَّ أَبَا هُرَيْرَةَ قَالَ: الطِّيَرَةُ فِي الْفَرَسِ، وَالْمَرْأَةِ، وَالدَّارِ، فَغَضِبَتْ غَضَبًا شَدِيدًا، وَقَالَتْ: (مَا قَالَهُ). وَإِنَّمَا قَالَ: إِنَّ أَهْلَ الْجَاهِلِيَّةِ كَانُوا يَتَطَيَّرُونَ مِنْ ذَلِكَ)[٩٦]. واتە: دوو پیاو چوونە لای خاتوو عائیشە (رەزای خوای لێ بێت) و وتیان: ئەبوهورەیرە دەڵێت: کە ئەسپ و ئافرەت و خانوو دەکرێت ببنە مایەی بەدبەختی و شوومی بۆ مرۆڤ. خاتوو عائیشە (رەزای خوای لێ بێت)، کە گوێی لەمە بوو زۆر تووڕە بوو فەرمووی: پێغەمبەری خوا ﷺ شتی وای نەفەرمووە، بەڵکو فەرموویەتی: خەڵکی لە سەردەمی نەفامییدا ئەم شتانەیان بە مایەی بەدبەختی و شوومی سەیر دەکرد.

---

هەندێکی تریش دەڵێن مەبەست لە (هَامَ) کوندە پەپوە کە ئەگەر لە سەر هەر ماڵێك بنیشتایەتەوە پێیان وابوو کە دەبێتە مایەی کاول بوون و تێك چوونی ئەو ماڵە.

[٩٣] - صَفَر: هەندێك لە زانایان دەڵێن (صَفَر) نەخۆشیەکی سك یەشە بووە بە هۆی کرمێکەوە دروست دەبوو، لە ناو عەرەبدا وا باو بووە کە ئەو نەخۆشیە دەگوازرێتەوە. هەندێکی تر دەڵێن مەبەست لە (صَفَر) مانگی صفر بووە کە عەرەب بە مانگێکی شوم و نەگبەتیان زانیوە و سەیر کردووە.

[٩٤] - نَوْء: قۆناغێکە لە قۆناغەکانی مانگ، هەندێکیش دەڵێن ناوی ئەستێرەیەك بووە و کاتی خۆی پێش هاتنی ئیسلام کاتێك کە باران باریبێت وتویانە بە هۆی ئەو ئەستێرەیەوە بارانمان بۆ دەبارێت.

[٩٥] - غُول: لەناو عەرەبدا وا باو بووە کە (غُولَ) جنیەکە لە دەشت و دەر و چۆڵەوانیدا پەیدا دەبێت و بە چەندین شێوە خۆی دەگۆڕێت و رێگە لە خەڵکی و کاروانچی ون دەکات و دەیانفەوتێنێت.

[٩٦] - الإمام أحمد- المسند- ج٤٢/ص٨٨- الحديث (٢٥١٦٨).

**پێنجەم:** مەبەست لە شوومی و نەگبەتی ئافرەت لە فەرموودەکاندا بەو شێوەیە نییە کە لە سەردەمی نەفامییدا راڤەی بۆ کراوە، کە خودی کەسەکە یان شتەکە ببێتە مایەی نەگبەتی و شوومی چونکە وەکو باسمان کرد ئەم جۆرە بۆچوونە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ سەرجەم دەقەکانی تردا.

کەواتە دەبێت شتێکی تر هەبێت ئەمە دروست بکات، کە ئەویش بێگومان ئاکارەکانی یاخود خووە خراپەکانی وای لێدەکەن کە ئافرەت بۆ پیاو ببێتە مایەی خەفەت و بارگرانی، وەك دەمەوەریی، یان لاساریی، یان ناپاکی، یان هەر شتێکی تر کە ببێتە مایەی ئاڵۆزکردنی ژیانی هاوسەرگیریان، هەر وەك چۆن خانووش هەندێکجار بە هۆی دراوسێی خراپەوە پیاو تێیدا ئاسوودە نابێت، کەواتە خودی ئافرەت خۆی نابێتە مایەی شوومی و نەگبەتی، بەڵکو ئاکار و رەفتارە ناشیرینەکانی وای لێ دەکەن کە دەبێتە بەڵا و نەگبەتی بۆ هاوسەرەکەی.

بەڵگەی راستی ئەم بۆچوون و راڤەکردنەش ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: {لَاشُـؤْمَ. وَقَـدْ يَكُـونُ الْـيُمْنُ فِـي الـدَّارِ، وَالْمَـرْأَةِ، وَالْفَرَسِ}[97]. واتە: هیچ شتێك نییە ببێتە مایەی نەگبەتی و بەدبەختی مرۆڤ، ئەگەر خێر و چاکە لە شتێکدا هەبێت، ئەوە لە خانوو، ئافرەت و ئەسپدایە.

لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: {الدُّنْيَا مَتَاعٌ وَخَيْرُ مَتَاعِ الدُّنْيَا الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ}[98]. واتە: دونیا هەمووی خۆشیەکی کەمە، باشترین و چاکترین خۆشی دونیا ژنێکی باش و گونجاوە.

---

[97] - الترمذي- سنن الترمذي- ج٥/ص١٢٦- كتاب (٤٥) العلم/ باب (٥٨) ما جاء في الشؤم- الحديث (٢٨٢٤). وصححه الشيخ الألباني: في صحيح الجامع حديث رقم : ٧٥٠٠. إبن ماجة- سنن إبن ماجة- ج١/ص٦٤٢- كتاب (٩) النكاح/ باب (٥٥) ما يكون فيه اليمن والشؤم/ الحديث (١٩٩٣).

[98] - مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص١٧٨- كتاب (١٨) الرضاع/ باب (١٧) خير متاع الدنيا المرأة الصالحة- الحديث (٣٧١٦). إبن حبان- صحيح إبن حبان- ج٩/ص٣٤٠- ذكر البيان بأن المرأة الصالحة للمؤمن خير متاع الدنيا- الحديث (٤٠٣١).

کەواتە ئەم فەرموودەیە بە پێچەوانەی فەرموودەکانی ترەوە، باس لەوە دەکات کە ئەگەر خێر و خۆشی لە شتیکدا هەبێت ئەوە دەکرێت لە ئافرەتدا بێت، ئەویش بەوەی کە ئافرەتەکە خوو و ڕەفتاری باش بێت و تەبا و گونجاو بێت لەگەڵ هاوسەرەکەی.

هەر بۆیەیشە کە ئافرەت خۆی بۆ خۆی نابێتە مایەی خێر، یان خراپە، بەڵکو ئاکار و ڕەفتارەکانی وای لێ دەکەن کە ببێتە مایەی خۆشبەختی، یان بەدبەختی مرۆڤ.

**شەشەم:** ڕوویەکی تری ئەم فەرموودانە ئەوە دەگرێتەوە کە پێغەمبەری خوا ﷺ لەم فەرمودانەدا نەفی ئەم جۆرە بۆچوونانە دەکات کە شتێك ببێتە مایەی نەگبەتی و شوومی لە ژیانی مرۆڤدا، بەبێ بنەمایان لە قەڵەم دەدات وەك لە سەرەتای فەرموودەکەدا بەدەر دەکەوێت و دەفەرموێت: {لاَ عَدوى، ولاَ طِيَرَةَ}.

بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا و لە واقیعدا و لە کۆن و ئێستاشدا هەمیشە خەڵکانێك هەبوون و هەن کە بە چاوی گومانەوە سەیری ئەم جۆرە شتانەیان کردووە، هەندێکجار بە مایەی نەگبەتی و بەدبەختییان زانیون، بۆیە پێغەمبەری خوا ﷺ ئاماژە بەم ڕاستییە دەکات لە ناخی خەڵکدا هەیە، نەك لە شەرعدا وایە، واتە کە دەفەموێت: {وَإِنَّمَا الشُّؤْمُ فِى ثَلاَثَةٍ}. مەبەستی ئەوەیە لای خەڵکانێك وایە، یان خەڵکانێك وا بیر دەکەنەوە، هەر بۆیەیشە لە فەرموودەی دووەمدا بە گومانەوە باسی لێوە دەکات و ئەو جۆرە بۆچوونانە لاواز نیشان دەدات و دەفەرموێت: {إِنْ كَانَ الشُّؤْمُ فِى شَىْءٍ}. واتە: هەر چەند لە ڕاستییدا شتی وانییە، بەڵام ئەگەر نەگبەتی و بەدبەختی لە شتێکدا هەبێت وەك خەڵك بۆی دەچێت، ئەوە خەڵك لەم سێ شتەدا بەدییان دەکات.

ماوەتەوە ئەوە بڵێین کە مرۆڤی باوەڕدار هەمیشە دەبێت باوەڕی وابێت کە هیچ سوودێك، یان زیانێکی پێ ناگات مەگەر ئەوە نەبێت کە خوا خۆی بڕیاری لەسەر داوە و دیاری کردووە، قەت خوا هیچ دروستکراوێکی خۆی نەکردووەتە

مایەی نەگبەتی و شوومی بۆ خەڵکی تر، مرۆڤ زۆرجار کە توشی ناڕەحەتی، یان نەهامەتییەك دێت بە هۆی کردەوەی بەدی خۆیەوەیەتی، یان خوا دەیەوێت تاقی بکاتەوە. ژن و پیاویش لە هەموو ئەم خاڵانەی کە باسمان کردن هاوبەشن.

کەواتە چۆن ژنێکی بەدخوو و شڕ دەبێتە مایەی نەگبەتی و سەرگەردانی، بەهەمان شێوە پیاوێکی بەدخوو و شڕیش دەبێتە مایەی نەگبەتی و سەرگەردانی ژن و خێزان.

### فەرموودەی شەشەم:

عَنْ جَابِرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : {أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ رَأَى امْرَأَةً، فَدَخَلَ عَلَى زَيْنَبَ بِنْتِ جَحْشٍ فَقَضَى حَاجَتَهُ مِنْهَا، ثُمَّ خَرَجَ إِلَى أَصْحَابِهِ فَقَالَ لَهُمْ: إِنَّ الْمَرْأَةَ تُقْبِلُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، وَتُدْبِرُ فِي صُورَةِ شَيْطَانٍ، فَإِذَا أَبْصَرَ أَحَدُكُمْ امْرَأَةً فَلْيَأْتِ أَهْلَهُ" فَإِنَّ ذَلِكَ يَرُدُّ مَا فِي نَفْسِهِ})[99].

واتە: جابری کوڕی عەبدوڵڵا دەفەرموێت: پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرتێکی بینی، پاشان چووە لای زەینەبی کچی جەحشی خێزانی و پاشان هاتەوە لای هاوەڵانی و پێی فەرموون: ئافرەت لە سەر شێوەی شەیتان روو دەکات و لەسەر شێوەی شەیتان پشت هەڵدەکات، هەر یەکێکتان ئافرەتێکی بینی و سەرنجی راکێشا بابچێتە لای خێزانی، ئەوە شوێنەواری ئەو سەرنجە و کاریگەرییە لەسەر دەروونی لا دەبات.

دیارە ئەم فەرموودەیەش هاوشێوەی فەرموودەکانی تر ئەگەر تەنیا راڤەکردنێکی رووکەشی بۆ بکەین ئەوا توشی کۆمەڵێك ئاڵۆزیی و گومانمان دەکات،

---

[99] - مسلم- صحيح مسلم- ج٤/ص١٢٩- كتاب (١٧) النكاح/ باب (٢) ندب من رأى امرأة فوقعت في نفسه إلى أن يأتي امرأته أو جاريته فيواقعها الحديث (٣٤٧٣). الإمام أحمد- المسند- ج٢٢/ص٤٠٧- الحديث (١٤٥٣٧).

جا بۆ ڕەواندنـەوەی ئـەو ئـاڵۆزی و گومانانـە و تێگەیـشتنی زیـاتر لـە چـەمکەکانی فەرموودەکە، ئەم چەند خاڵە دەخەینە ڕوو:

**یەکەم:** مەبەست لە وشەی {الْمَرْأَةَ} لـەم فەرموودەیـەدا کـە دەفـەرموێت {إِنَّ الْمَرْأَةَ} هەرچەند بە گشتگیری گوزارشتی لێ کراوە، بـەڵام مەبەسـتی فەرموودەکـە تەنیا ئەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کە نامەحرەمن و بە هۆیانەوە پیـاو توشـی تـاوان و گوناه دەبن، دایك، یان کچ، یان خوشکی مرۆڤ ناگرێتەوە، چونکە ئەمانە قەت جێی سەرنجی بەدی پیـاو نـین تـا ببنـە مایـەی لەخـشتەبردنی مـرۆڤ، کەواتـە هەرچـەند وشەکەش بەگشتیی هاتووە، بەڵام مەبەست پێی کەسانێکی تایبەتن.

ئەم شێوازی گوزارشـتکردنەش لـە عەرەبییـدا زۆرە و تەنانـەت لـە قورئانیـشدا بەکار هاتووە، بۆ نموونە خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفـەرموێت: ﴿أَمْ يَحْسُدُونَ النَّاسَ عَلَى مَا آتَاهُمُ اللَّهُ مِنْ فَضْلِهِ﴾[100]. واتە: یان ئەوان –بێباوەڕان– ئێرەیی بـە خـەڵکی دەبـەن کـە خـوا لـە میهرەبـانی خۆیـەوە بەخشـشی لەگـەڵ کـردوون، جـا هەرچەند وشەی (الناس) لە زمانی عەرەبیدا وشەیەکی گشتگیرە و هـەموو خـەڵکی دەگرێتـــەوە، بـــەڵام لـــەم ئایەتـــەدا مەبەســـت پێـــی تـــەنیا پێغەمبـــەر ﷺ و ئومەتەکەیـەتی، چـونکە بێبـاوەڕان لـە جوولەکـە و خاچپەرسـتەکان ئێرەییـان پـێ دەبردن.

کەواتە ئەم فەرموودەیە ڕەگەزی مێینە ناگرێتەوە بە گشتیی، بەڵکو تەنیا ئـەو ئافرەتانە دەگرێتەوە کە نامەحرەمن بە پیاو و بە شێوەیەك دەردەکەون کە دەبنـە جێی سەرنجی پیاو و لەخشتەبردنی.

**دووەم:** کاتێك پێغەمبـەری خـودا ﷺ دەفـەرموێت: ئـافرەت لەسـەر شـێوەی شەیتان ڕوو دەکات و لەسەر شێوەی شـەیتان پـشت هەڵدەکات، دیـارە مەبەسـتی ئەوە نییە کە ئافرەت لە هەموو ڕوویەکەوە وەك شەیتان وایـە، چـونکە ئـەم جـۆرە

---

[100] - سورة النساء: الآية: ٥٤.

تێگەیشتنە دژ دەوەستێتەوە لەگەڵ هەموو ئەو دەقانەی قورئان و سوننەت کە باس لە ڕێز و گەورەیی مرۆڤەکان دەکەن بەگشتیی، چونکە خوای پەروەردگار لە چەند شوێنێك لە قورئاندا باس لەوە دەکات کە چۆن منەتی لەگەڵ نەوەکانی ئادەم کردووە، لەسەر جوانترین و باشترین شێوە دروستی کردوون ڕێزی لێ ناون، لەم بارەیەوە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾[101]. واتە: ئێمە مرۆڤمان لە سەر جوانترین و باشترین شێوە دروست کردووە.

دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ﴾[102]. واتە: ئێمە ڕێزمان لە نەوەکانی ئادەم گرتووە، هەر لە چوارچێوەی ئەم ڕێزگرتنەدا بووە کە خوای پەروەردگار فەرمانی بە سەرجەم فریشتەکانی کردووە کە کڕنووشی ڕێزلێنان بۆ ئادەم ببەن.

جا ئایا دەگونجێت پێغەمبەری خوا ﷺ بە پێچەوانەی ئەو هەموو دەقانەوە ئافرەت بە شەیتان بشوبهێنێ؟.

**سێیەم:** شەیتان لە قورئاندا نموونەی ناشیرینی و قێزەونی و بێزراوییە، خوای پەروەردگار کە باسی سزا و ناخۆشییەکانی دۆزەخ دەکات باسی درەختی ﴿الزَّقُّوم﴾ دەکات، کە خواردنی خەڵکی دۆزەخە، لە وەسفی بەرەکەیدا دەفەرموێت: ﴿طَلْعُهَا كَأَنَّهُ رُؤُوسُ الشَّيَاطِينِ﴾[103]. واتە: بەری ئەو دارە لە ناشیرینی و نەخوازراوییدا وەکو سەری شەیتانەکان وایە.

جا ئەگەر شەیتان نموونەی ناشیرینی و خراپە و ترساندن بێت، ئافرەتیش نموونەی جوانی و ناسکی بێت، کەواتە دەبێت مەبەست و هۆکارێکی تر هەبێت لە پشت ئەو شوبهاندنەوە، دیارە ئەو مەبەستەش بەراوردکردنە لە نێوان یەك خاڵی هاوبەشی نێوان ئافرەتی نامەحرەم و شەیتان و کاریگەرییان لەسەر پیاو.

---

[101] - سورة التين: الآية: ٤.

[102] - سورة الإسراء: الآية: ٧٠.

[103] - سورة الصافات: الآية: ٦٥.

ئـەویش لـەو رووەوەی کـە چـۆن شـەیتان هەمیـشە لـە هـەوڵی فریـودانی مرۆڤەکاندایە لە ڕێی جوانکاری و ڕازاندنەوەی شتە یاساغەکانەوە، ئافرەتانیش زۆر کات ئەم ڕۆڵە دەبینن و دەبنە مایەی لاڕێخستنی پیاوان و لەخشتەبردنیان بـەهۆی دەرخستن و نمایشکردنی ئەو جوانییە سروشتییەی کە خـوا پێـی داون لـە بـەردەم کەسانی نامەحرەمدا.

چونکە ئەو جوانیانەی کـە ئـەو جـۆرە ئافرەتانـە نمایـشی دەکـەن لـە بـەردەم پیـاوانی بێگانـەدا وەك جـوانی و لەزەتـە یاسـاغ و رووکەشـەکانی دونیـا وایـە و لـە خەڵکی بـاوەڕدار حـەرامن و یاسـاغن و لـەزەتێکی کـاتی و سـزایەکی هەمیـشەیی و نەبڕاوەی بەدوادا دێت.

بۆیە زۆر هەڵەیە ئەگەر ئێمـە بڵـێین یـان واتێبگـەین کـە پێغەمبـەری خـوا ﷺ فەرموویـەتی ئـافرەت وەکـو شـەیتان وایـە، بـەڵکو مەبەسـتی ئەوەیـە کـە ئـەو کاریگەرییەی جوانیی ئافرەت لەسەر پیاوی دروست دەکات و ئاکامەکەیـشی وەکـو ئەو کاریگەرییە وایە کە شەیتان لەسەر خەڵکیی دروستی دەکات و بە جوانییـەکانی دونیا فریویان دەدات.

یان دەکرێت بڵێین مەبەستی فەرموودەکە ئەوەیـە کـە شـەیتان ڕۆڵێکـی بـەد و خراپ دەبینێت لە پەیوەنـدی نێـوان ئافرەتـانی نامـەحرەم و پیاوانـدا، بـەوەی کـە هەرکات پیاو ئافرەتێك دەبینێـت ئـیتر شـەیتان هـەتا ئـەو ئافرەتـە دێـت و تێپـەڕ دەبێت لـە هـەوڵی ئەوەدایـە کـە چـۆن جوانییـەکانی ئـەو ئافرەتـە لای ئـەو پیـاوە بڕازێنێتەوە و پێی فریو بدات، لە کاتێکدا لەوانەیـە خێزانـی خـۆی سـەد قـاتی ئـەو ئافرەتە جوانتر بێت، بەڵام بۆ خێزانی خۆی شـەیتان ئـەو ڕۆڵـە نابینێـت، بـەس بـۆ خەڵکی بێگانە و کاری حەرام ئـەو ناپاکییـە دەکـات، بۆیـە پێغەمبـەری خـودا ﷺ دەفـەرموێت: ئـافرەت لـە سـەر شـێوەی شـەیتان ڕوو دەکـات و لەسـەر شـێوەی شەیتان پشت هەڵدەکات.

**چوارەم:** هەر وەك چۆن خوای پەروەردگار بەری ئەو دارەی دۆزەخ بەسەری شەیتانەکان دەشوبهێنێ، بۆ ئەوەی زیاتر بێزراو و قێزەونی بکات، پێغەمبەری خوایش ﷺ ئەو ئاکار و کاریگەرییەی ئافرەت بە ئاکار و کاریگەری شەیتان دەشوبهێنی، بە مەبەستی ئەوەی کە ئەو جۆرە رەفتارانە بێزراو و قێزەون بکات لای خەڵکی باوەڕدار و خەڵکیی ئاگادار بکاتەوە لە گەورەیی و مەترسی ئەو جۆرە تاوانانە، جا چ ئافرەتان ئاگادار بکاتەوە لەوەی کە بۆ پیاوی نامەحرەم و بۆ بازاڕ و شوێنە گشتییەکان خۆیان نەڕازێننەوە و نەبنە مایەی خراپە و لاڕێ خستنی خەڵکی، چ پیاوان ئاگادار بکاتەوە کە چاویان لە ئاست ئەو جۆرە جوانییانە بپۆشن و بەدویدا نەڕۆن، چونکە ئەو جوانییانە هاوشێوەی جوانییەکانی دونیا و شتە یاساغەکان لە مرۆڤی باوەڕدار قەدەغەن و ئاکامەکەی تەنیا مایەپوچی و پەشیمانی دونیا و قیامەتی لە دوایە.

کەواتە مەبەستێکی تری ئەم تەشبیهە بێزراوکردنی ئەو جۆرە شتە یاساغانەیە بەلای مرۆڤی باوەڕدارەوە چ ژن بن یان پیاو.

**پێنجەم:** سەرەڕای ئەوەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ لە برگەی یەکەمی فەرموودەکەدا و لە رێی ئەو جۆرە تەشبیهەوە ویستویەتی قەناعەت بە هەردوو رەگەزی مرۆڤی باوەڕدار بکات، کە واز لەو جۆرە کارانە بهێنن و شوێنی نەکەون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەزانێت کە خەڵکانێکی زۆر هەن دەبنە نێچیری شەیتان و لە ساتێك لە ساتەکانی باوەڕکزییدا توشی ئەم جۆرە حەرامانە دەبن، بۆیە وەك مامۆستایەکی دڵسۆز و نوژدارێکی لێزان هەوڵی ئەوەی داوە کە بە زووترین کات کاریگەریی ئەو تاوانە لەسەر ناخی باوەڕداران بسڕێتەوە و رێگەی خۆپڕگارکردنیان نیشان بدات و دەفەرموێت: هەر یەکێکتان ئافرەتێکی بینی و سەرنجی راکێشا بابچێتە لای خێزانی، ئەوە شوێنەواری ئەو سەرنجە و کاریگەرییەکەی لەسەر دەروونی لا دەبات.

شەشەم: ئەم شێوازەی کە جابر فەرموودەکەی پێ دەگێڕێتەوە شێوازێك بووە لە شێوازەکانی فێرکردنی پێغەمبەر ﷺ بۆ هاوەڵانی، کە زۆرکات هەوڵی داوە بە عەمەلی و وەك مامۆستایەك خۆی کارێك بکات لە پێشچاوی هاوەڵەکانی تا ئەوانیش چاوی لێبکەن و شوێنپێی هەڵبگرن، چونکە جابر دەفەرموێت پێغەمبەری خوا ﷺ ئافرەتێکی بینی و پاشان چووە لای زەینەبی کچی جەحشی خێزانی.. هتد.

هەرچەند خەڵکانێکی نەفسنزم و کەمفرسەت هەوڵیان داوە ئەم فەرموودەیە بەو شێوازەی کە لەگەڵ ڕەوشتی بەد و دەروونی نەخۆشیاندا دەگونجێت ڕاڤە بکەن، بەڵام هیچ بەڵگەیەکیان بەدەستەوە نییە تا بۆچوونە لاوازەکانیانی پێ پشتڕاست بکەنەوە، کە گوایە وای ڕاڤە دەکەن، کە ئەو ئافرەتە سەرنجی پێغەمبەری خودای ﷺ ڕاکێشاوە و پێغەمبەری خودا ﷺ لە کاردانەوەی بینینی ئەودا ئەو کارەی کردووە.

لە کاتێکدا لە هیچ کام لە ڕیواتەکانی ئەم فەرموودەیەدا باسی ئەو ئافرەتە نەهاتووە کە ئایا کێ بووە، پیر بووە، یان گەنج، جوان بووە، یان ناشرین، تا بزانین کاریگەریی هەبووە لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺیان نا؟

پاشان ئەگەر گریمان ئەو ئافرەتە زۆر جوانیش بوبێت، ئایا پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوەندە ئارەزووباز بووە تا خۆی پێ نەگیرێت تا دانیشتنەکەی لەگەڵ هاوەڵەکانی تەواو بکات و یەکسەر جێیان بهێڵێت، بچێتە لای خێزانی و پاشانیش بێتەوە لایان ئەوەشیان پێ بفەرموێت؟.

باشە نەیدەتوانی تۆزێك خۆی بگرێت تا هاوەڵانی بەجێی دەهێڵن و پاشان ئەو کارە بکات و کەسیش پێی نەزانێت؟.

بەڕاستی ئەمانە هەمووی زۆر دوورن لە ڕاستییەوە و زۆر دوورن لە ڕەوشتی بەرزی پێغەمبەری سەروەرمانەوە ﷺ کە هەموو ژیانی خۆی بۆ خواپەرستی و خزمەتکردنی خەڵکی تەرخان کردبوو، تەنانەت شەوانیشی بە شەونوێژ زیندوو

دەکردەوە و ئەوەندە شەونوێژی دەکرد تا قاچی موبارەکی دەئاوسا و ئەستوور دەبوو.

کەواتە راستیی مەسەلەکە ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ ویستویەتی حوکمێکی شەرعی بە شێوازێکی کرداری بۆ هاوەڵانی روون بکاتەوە و تێیان بگەیەنێت، کە ئەمە جۆرێکە لە جۆرەکانی چارەسەرکردن و بنەبڕکردنی شوێنەوارەکانی تاوان لە ناخی مرۆڤی باوەڕداردا.

ئەگەر بینینی ئافرەتەکە کاریگەرییەکی هەبووبێت، ئەوە زیاتر لەوەوە نزیکە کە کاریگەری لەسەر هەندێك لە هاوەڵانی دانیشتنەکە دروست کردبێت، نەك لەسەر ناخی خودی پێغەمبەر ﷺ، پاشان پێغەمبەر ﷺ ویستبێتی بەو شێوەیە فێریان بکات کە چۆن خۆیان لەو کاریگەرییە رزگار بکەن، ئەم حوکمەیش حوکمێکی گشتییە بۆ ئەوان و بۆ سەرجەم موسڵمانانیشە.

## کۆتایی:

سوپاس و ستایش بۆ زاتی تاکی پاکی پەروەردگار، لەسەر هەموو نیعمەت و بەخششەکانی و لە پێش هەموویانەوە نیعمەتی ئیسلام، درووود و رەحمەت بۆ سەر گیانی پاکی پێشەوا و سەروەری مرۆڤایەتی حەزرەتی موحەممەد ﷺ و گشت یار و یاوەران و شوێنکەوتوانی بە گشتیی.

لە کۆتا زنجیرەی باسەکەماندا پێمخۆشە خەرمانی هەموو ئەو دەرئەنجامانە بخەمە بەر دیدەی ئێوەی بەڕێز، کە لە ئەنجامی ئەم توێژنەوەیەدا بەردەستمان دەکەوێت، هەر لە روانگەی ئەو دەرئەنجامانەیشەوە کۆمەڵێك پێشنیاز پێشکەشی ئێوەی ئازیز بکەم.

هەر وەك ئاشکرایە کە توێژینەوەکە دوو تەوەرە لە خۆ دەگرێت:

**تەوەرەی یەکەم:** لەسەر رەواندنەوەی گومانەکانە لەسەر چۆنێتی و چەندێتی هاوسەرگیرییەکانی پێغەمبەر ﷺ.

**تەوەرەی دووەم:** لەسەر ڕەواندنەوەی گومانەکانە لەسەر چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەر ﷺ دەربارەی ئافرەتان.

بەڵام ئێمە لە باسکردنی دەرئەنجامەکاندا هەموو دەرئەنجامەکان سەبارەت بە هەردوو تەوەرەکە بەپێی گرنگییان دەخەینە ڕوو بەم شێوەیەی لای خوارەوە.

ـ ئایینی پیرۆزی ئیسلام کۆتا پەیام و ڕێسای خوای پەروەردگارە بۆ سەرجەم مرۆڤایەتی بە گشتیی بەبێ جیاوازیکردن لە نێوان هیچ کام لە تاکەکان، یان ڕەگەزەکان لە کۆمەڵگاکاندا.

ـ واتای ئایینیش تەنیا ئەو حوکمانە دەگرێتەوە کە سەرچاوەکەی قورئانی پیرۆز بن، یان سوننەتەکانی پێغەمبەر ﷺ بن، بەدەر لەم دوانە قسەی هیچ زانا و شەرعناسێك ماڵ نییە لەسەر ئیسلام و ناشکرێت وەکو ئایین سەیر بکرێت.

ـ هەڵسەنگاندن، یان تێڕوانینی ئیسلامیش بۆ هەر مەسەلەیەك ناکرێت تەنیا لە فەرموودەیەکەوە وەربگیرێت، بەبێ ئەوەی بگەڕێینەوە سەر هەموو ئەو بەڵگانەی تر کە لەو بارەیەوە هاتوون، یان دڵنیا بین لەوەی کە تا چەند ئەو فەرموودەیە دروستە، یان نا؟ ئایا حوکمەکەی سڕاوەتەوە یان هەر ماوە، یان حوکمەکەی تایبەتە یان گشتگیرە؟ یان بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەو شوێن و بارودۆخەی کە ئەو فەرموودەیەی تێدا وتراوە، یان گەڕانەوە بۆ شرۆڤە و ڕاڤەکردنی زانایان بۆ ئەو فەرموودەیە، کە بەمانە هەمووی پێکەوە ئەوجا دەتوانین قسە لە سەر فەرموودەیەك بکەین و بیکەینە بەڵگە بۆ سەلماندنی کارێك، یان حوکمێکی شەرعی.

ـ ڕەگەزی نێر و مێ لە دیدی ئیسلامدا دوو جەمسەری هاوتا و پێکهێنەر و تەواوکەری یەکترن و هیچ کامیان بەبێ ئەوی تریان بوونی نییە و نابێ و پەیوەندییەکانی نێوانیشان لەسەر بنەمای ڕێز و خۆشەویستی و دادپەروەری لە دابەشکردنی ئەرك و مافەکاندا و بە ڕەچاوکردنی تایبەتمەندییە جەستەیی و دەروونییەکانی هەریەکەیان بنیات نراوە، بەدەر لەمانە هیچ کام لەم دوو ڕەگەزە لە سەر بنەمای ڕەگەزیی ڕێزی لە بەرامبەرەکەی زیاتر نییە.

ـ هیچ کام لەو پرۆسە هاوسەرگیرییانەی کە پێغەمبەر ﷺ ئەنجامی داون بچووکترین ڕەخنەی شەرعیی، یان یاسایی هەڵناگرن لە هیچ ڕوویەکەوە، چونکە هەموو ئەو هاوسەرگیرییانەی کە ئەنجامی داون هەموو مەرجە شەرعییەکان و

یاساییەکانیان تێدا بووە، تەنانەت بە پێوەرە یاساییەکانی سەدەی بیست و یەکەمیش.

ـ گێڕانەوەی هۆکاری زۆریی خێزانەکانی پێغەمبەر ﷺ بۆ مەسەلەی ئارەزووبازی قسەیەکی بێبنەما و بێبەڵگەیە، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ تا تەمەنی بیست و پێنجساڵییش هەر بیری لە ژنهێنان نەکردووەتەوە، تا خاتوو خەدیجە خۆی پێشنیازی ئەوەی بۆ کردووە کە شووی پێ بکات، ئەو کاتیش خاتوو خەدیجە تەمەنی پازدە ساڵ لە پێغەمبەری خودا ﷺ گەورەتر بووە، پاش ئەویش تا تەمەنی پەنجا ساڵییش بیری لە ژنهێنان نەکردووەتەوە، تا خاتوو خەدیجە کۆچی دوایی کردووە و پاشتر بێوەژنێکی تری هێناوە کە ئەویش پازدە ساڵ لە خۆی گەورەتر بووە، دواتر خێزانەکانی تری هێناوە، جا ئەگەر کەسێك ئارەزووباز بێت ئایا دەگونجێت تا تەمەنی بیست و پێنج ساڵی هەر بیر لە ژنهێنان نەکاتەوە و پاشانیش رازی بێت بەوەی هەموو تەمەنی لاویی لەگەڵ ئافرەتی بێوەژن و بەساڵاچوودا بەسەر بەرێت؟.

ـ دواتر ئەگەر کەسێك لە سەرەتای لاوی و لەو کاتەی کە مرۆڤێکی ئاسایی و سادە بووە ئاوا ژیابێت، دەکرێت لە تەمەنی پیری و پاش پێسپاردنی ئەرکی پیرۆزی پێغەمبەرایەتی ئالوودەی کاری ئارەزووبازی بووبێت؟.

ـ لە پاش ئەوەیش لە ناو هەموو ئەو خێزانانەی کە هێناونی تەنیا خاتوو عائیشە کچ بووە و هەموو ئەوانی تر بێوەژن بوون، لە کاتێکدا ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ کەسێکی ئارەزووباز بوایە دەیتوانی هەموو خێزانەکانی کچ بن و بگرە جوانترین و هەڵکەوتووترین ئافرەتانی عەرەبیش بن، چونکە هەموو ئافرەتێك ئاواتی بەوە دەخواست کە ببێتە خێزانی پێغەمبەر ﷺ و هەموو بنەماڵەیەکیش بە شانازییان دەزانی کە کچی بدەنێ، بەڵام بە پێچەوانەوە زۆرێك لەو هاوسەرگیرییانەی کە پێغەمبەری خودا ﷺ ئەنجامی داون ئەرك و بارقورسی بوون بۆ خۆی و لەسەر خواست و لە پێناو ئارەزووی خۆیشیدا نەیهێناوە، بەڵکو لەسەر

فەرمانی خوای گەورە، یان لەسەر داوای ئافرەتەکان خۆیان، یان وەك سۆزێکی مرۆڤایەتی و پێغەمبەرایەتی، یان لەبەر بەرژەوەندی بانگەوازەکەی بووە.

- سەرەڕای ئەمانە هەمووی، پێغەمبەری خودا ﷺ هەموو ژیانی بە هەژاری و نەداری گوزەراندووە و ئەمە جگە لە خەریکبوون و سەرقاڵی بەردەوامیشی بە کاری بانگەواز و پەرستشکردن بۆ خوای پەروەردگار، ئەمەیش پێچەوانی ژیان و ئاکاری ئەو کەسانەیە کە سەرقاڵی ئارەزووبازی و ژیانی دونیان.

- ئایینی پیرۆزی ئیسلام هەر لە سەرەتای هاتنیەوە بە ئایینی چەوساوە و هەژاران ناسراوە و بەرگری تەواوی لە ماف خەڵکانی چەوساوە و ژێردەست کردووە، لە پێش هەموویشیانەوە ماف ئافرەتان، هەر بۆیە شتێکی نامۆ نییە کە دەبینین یەکەم کەس کە باوەڕی بەم ئایینە پیرۆزە هێناوە خاتوو خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر ﷺ بووە، یەکەم شەهیدیش لە پێناو ئەو ڕێبازەدا هەر ئافرەت بووە، بۆیە زۆر جێی سەرسوڕمانە کە خەڵکانێك باس لەوە بکەن کە دەقێك هەبێت لە ئیسلامدا سووکایەتی بە ئافرەت بکات، یان لە ڕێزی کەم بکاتەوە؟ بەڵکو هەموو ئەو دەقانە بە هەڵە بەو شێوەیە ڕاڤە دەکرێن، ئەو دەقانەیش کە لەم توێژینەوەیەدا باسمان کردوون زەقترینی ئەو دەقانەن کە دوژمنانی ئیسلام لەو بوارەدا و لەپێناو بەدیهێنانی نیازە گڵاوەکانیاندا بەکاری دەهێنن، گەر نا لە ڕاستییدا وانین، ڕووی ڕاستیی ئەو دەقانەمان لە توێژینەوەکەدا بە وردی باس کردووە.

- ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئایینی زۆرینەی هەرەزۆری میللەتی کوردە بە خەڵکانی ئیسلامیی و عەلمانییەوە، پیرۆزییەکی تایبەتی خۆی هەیە لە دڵی هەموو خەڵکیدا، پێدەچێت تاکە خاڵێکی هاوبەش بێت لە نێوان هەموو هێز و هۆز و تیرە و چین و توێژەکانی گەلەکەماندا، هەر بۆیە ناکرێت بە ناوی ئازادی بیروڕاوە خەڵکانێکی هەرزە و کاڵفام ڕێگە بە خۆیان بدەن، یان ڕێگە بدرێن لە میدیا و گۆڤار و ڕۆژنامە جیاجیاکاندا قسەی بەرز و نزم و بێبنەما بەرامبەر بە خوا، یان پێغەمبەر ﷺ، یان قورئان، یان هەر بنەمایەك، یان دروشمێکی ئەو ئایینە بکەن و سووکایەتی بە پیرۆزییەکانی میللەت بکەن، بەبێ ئەوەی هیچ شارەزاییەکیان لەسەر ئەو بابەتانە هەبێت کە قسەی لەسەر دەکەن، یان ئامادەبیان هەبێت گفتوگۆی لەسەر بکەن، پێویستە یاسا ڕێوشوێنی گونجاو بگرێتە بەر بۆ ڕێگەگرتن لەو جۆرە دیاردە دزێوانە و سزای توند لەسەر هەموو ئەو کەسانە دابنێت کە ئەو جۆرە کارانە دەکەن.

- ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێت کە خەڵك بە هیچ شێوەیەك بۆی نەبێت قسە لەسەر ئایین بکات، یان پرسیاری لەسەر کۆمەڵێك شت بۆ دروست نەبێت، یان ڕەخنەی لێ نەگرێت، بەڵکو خوا خۆی کە عەقڵ و ژیریی بەخشیوە بە مرۆڤ و پاشان فروستادەکانی خۆی بۆ ڕەوانە کردوون، ویستی وابووە کە مرۆڤ عەقڵی کارا بکات و ژیرانە مامەڵە لەگەڵ دەوروبەریدا بکات و کوێرانە حوکم بەسەر هیچ شتێکدا نەدات، خۆیشی لە هەموو کەس زاناترە و دەیزانێ کە سەرئەنجام خەڵکانێك دەبن نەفس و شەیتان و دونیا گومرا و سەرلێشێواو و لاڕێیان دەکات و هەڵوێست وەردەگرن بەرامبەر بە ئایینەکەی.

بەڵام کەسێك کە ڕەخنەیەك دەگرێت پێویستە ڕەخنەگرتنەکەی بابەتییانە بێت و بنەمایەکی دروستی هەبێت، پاشانیش ئەو کەسە ئامادەبێت بەرگری لە قسەکانی خۆی بکات و لە بەردەم دادگا ئامادەبێت کە قسەکانی بسەلمێنێت، نەك خەڵکانێك لە ژێر پەردەی ئازادیی بیروڕادا کۆمەڵێك جوێننامە و سووکایەتی و قسەی ناشیرین و بوهتانی بێبنەما لەسەر شتە هەرە پیرۆزەکان بنووسن و بیر و ژیریی خەڵکیی پێ

ژەهراویی بکەن، لەو لایشەوە دەسەلات دەستەوسان تەماشایان بکات، یان دەست لە پشتیان بدات و کارئاسانییان بۆ بکات، بە ڕاستی ئەمە جێی نیگەرانیی خەڵکە.

من لێرەدا یەك پرسیار دەکەم: ئایا هێزی دەسەلات ئەو سووکایەتی و جوێنناماانە بەرامبەر بە خۆیان قبوڵ دەکەن؟ باشە بۆچی بۆ ئەوەیان خەڵك ئازاد نییە و هەر کەس شتێکیان لەسەر بنووسێت دەست بەجێ ڕاپێچی بەندینخانە و دادگا دەکرێت، بەلام سەبارەت بە ئایینی ئیسلام خەڵك ئازادە و بۆی هەیە هەموو شتێك بڵێت؟ بۆیە پێویستە دەسەلات بە خۆیدا بچێتەوە و بە یاسا ڕێگا لەو دیاردە دزێوانە بگرێت.

- پێویستە پارتە سیاسییە ئیسلامییەکان و ڕێکخراوەکانیان و مامۆستایانی ئایینی ئیسلامیی بەڕێز و خەڵکانی شارەزا و پسپۆڕ لە بوارە شەرعییە جیاجیاکاندا، هەوڵی جددیی بدەن بۆ ڕێگەگرتن لەم جۆرە کارانە، یەکەم: هەوڵدان و فشار خستنە سەر دەسەلات بۆ دانانی کۆمەڵێك دەقی یاسایی کە ڕێگە لەم جۆرە دیاردە دزێوانە بگرێت، دووەم: لە ڕێگەی توێژینەوە و نوسراو و بلاوکردنەوەی جیاجیاوە.

هەرچەند من مەبەستم ئەوە نییە و هەرگیزیش لەگەڵ ئەوە نیم کە وەلامی ئەو جۆرە کەسانە بدرێتەوە کە ئەو جۆرە بێڕێزییانە بەرامبەر بە پیرۆزییەکانی میللەت دەکەن، چونکە نە خۆیان نە بابەتەکانیان ئەوەندە هەڵناگرن کە مرۆڤ کاتی خۆیان پێوە بەسەر بەرێت، زۆریشیان هەر بەو مەبەستە ئەو جۆرە کارانە دەکەن کە خۆیان بێننە ناو ناوان و باس بکرێن، یان فرۆشی گۆڤار و ڕۆژنامەکانیانی پێ زیاد بکەن.

بەلام لەگەڵ ئەوەم با ئێمە ڕووی گەشی ئەم ئیسلامە بۆ خەڵکی بخەینە ڕوو، با بێین ئەو شتانەی ئالۆزییەکیان تێدایە و جێی قسە و باسن لەلای خەڵکیی بۆ خەڵکیان ڕوون بکەینەوە و ئالۆزییەکانی بڕەوێنینەوە، چونکە فەرهەنگ و کتێبخانەی زمانی کوردی زۆر هەژارە لە زانستە شەرعییەکاندا لە هەموو ڕووەیەکەوە (فیقهی، سیاسیی، ڕۆشنبیری، کۆمەلایەتی، ئابووری، مێژوویی و هتد)، تەنانەت هەندێك بوار لەو بوارانە هەن کە بە زمانی کوردی تەنانەت یەك کتێبیشی لەسەر نەنووسراوە، کە ئەمە بۆشاییەکی گەورەیە لە کتێبخانە و فەرهەنگی میللەتێکی موسڵماندا، بۆیە پێویستە هەموو لایەك بەجددیی بیر لەم مەسەلەیە بکەینەوە و کۆمەڵێك ڕێوشوێنی گونجاو

بگرینه بەر بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەلێنە، ئەویش لە ڕێگەی دروستکردنی کۆمەڵێك دەستە و ناوەندی توێژینەی زانستیی و یەکخستنی گشت هێز و تواناکان بۆ سەرخستنی ئەو پرۆژەیە.

- خاڵێکی گرنگی تر ئەوەیە کە ئێمە کولتوورێکی فیقهی زۆر دەوڵەمەندمان هەیە بە زمانی عەرەبی، بەڵام ئەو کولتووره ئەوەندە زۆر و ئاڵۆزە کە کەسێك زۆر شارەزا نەبێت زەحمەتە بتوانێت سەری لێ دەربکات، هەم لە ڕووی زمانی دارشتنەوە و هەم لە ڕووی بیرو بۆچوونە جیاوازەکانەوە لەسەر بابەتەکان، هەر بۆیە هەندێك جار کە دەگەڕێیتەوە سەر بابەتێکی فیقهی سەرت لێ دەشێوێت نازانیت بۆچوونی کێ ڕاستە و بەڵگەکانی بەهێزترە لەوەی دیکە؟ جا بۆ ئەوەی ئێمە خۆمان لەم ئاڵۆزیی و فرەبۆچوونییە بپارێزین و کولتوورێکی ئیسلامییانەی هاوچەرخی هەمە بابەت بۆ خۆمان دروست بکەین و بە زمانی کوردی بیخەینە بەر دەستی خوێنەری کورد، پێویستە هەوڵ بدەین ئەو ئاڵۆزی و فرەبۆچوونییە نەگوێزینەوە کولتووری ئیسلامیی کوردیی خۆمان، فیقهێکی ڕەسەنی بەڵگەدار دابڕێژینەوە کە تەنیا ئەو بۆچوونانەی تێدا تۆمار بکرێت کە ڕاست و دروستە و قسە هەڵناگرێت، ئەم شێوە دارشتنە پەیڕەو بکەین لە هەموو بوارەکاندا، چونکە سەردەمی ئێمە زۆر لە سەردەمانی پێشوو جیاوازترە، ناکرێت ئێمە لە سەدەی بیست و یەکدا بەهەمان عەقڵیەتی دە سەدەی پێشوو بنووسین و بخوێنینەوە، گرنگ ئەوەیە ئێمە ئاینی ئیسلام وەکو خۆی چۆنە ئاوها بیخەینەوە بەر دیدەی خەڵکیی بەبێ زیاد و کەم، نەك وەك ئەوەی خەڵکیی باسی دەکەن، ئەو هەڵە و کەم و کوڕییانەی کە لە سەردەمانی پێشوودا هەبوون ئێمە ڕاستیان بکەینەوە و ئاماژەیان پێ بکەین و پاساوی ئەو هەڵانەیش بۆ خەڵکی بخەینە ڕوو، بۆ ئەوەی دەرفەت بە خەڵکی بەد نەدەین نان و پیازی پێوە بخوات.

# لە کۆتاییدا:

بابەتەکانی ئەم توێژینەوەیە لەو بابەتانەن کە زۆر تەومژ و ئاڵۆزیی لەسەر دروست دەکرێت و خەڵکانێك رووی راستییەکانی تێدا دەشێوێنن.

هیوادارم کە توانیبێتم هەندێك لەو ئاڵۆزیی و رەخنە و گومانانەم وەڵام دابێتەوە، دڵنیایشم لەوەی کە ئەم کارەی منیش وەکو هەموو کارێکی تری مرۆڤکرد لە هەڵە و پەڵە بەدەر نییە، ئەگەر توانیبێتم شتێکی باشم خستبێتە بەر دیدەی خوێنەر ئەوە لە فەزڵی خواوەیە و سوپاسیش تەنیا بۆ ئەوە، ئەگەر هەر هەڵەیەکم کردبێت ئەوە لە خۆمەوەیە و خوا و پێغەمبەر ﷺ و ئایینی ئیسلام لێی بێبەرین.

وآخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين..

# پێرستی سەرچاوەکان:

١ـ ابن الأثير (المبارك بن محمد الجزري)– جامع الأصول في أحاديث الرسول ﷺ– دار الفكر/ بيروت– ط١/ ١٣٨٩.

٢ـ أحمد بن حنبل– المسند– مؤسسة الرسالة / بيروت– ط١٤٢٠/٢.

٣ـ أحمد بن الخطيب – وسيلة الإسلام بالنبي ﷺ– دار الغرب الإسلامي/ بيروت– تحقيق: سليمان العيد المحامي.

٤ـ إبن إسحاق– سيرة ابن إسحاق (المبتدأ والمبعث والمغازي)– معهد الدراسات والأبحاث للتعريف– تحقيق: محمد حميد الله.

٥ـ الألباني (محمد ناصر الدين الألباني)– صحيح السيرة النبوية– المكتبة الإسلامية / عمان– ط١.

٦ـ انجوغو أمبكي صمب– أروع القيم الحضارية في سيرة خير البرية– دار الكتاب يمبل/ السنغال– ط/١٤٢٧.

٧ـ البخاري (محمد بن إسماعيل البخاري)– صحيح البخاري– دار اليمامة / بيروت– ط١٤٠٧/٣– تحقيق: مصطفى ديب البغا.

٨ـ البيهقي (أحمد بن الحسين بن علي) – دلائل النبووة– دار الكتب العلمية و دار الريان– بيروت– ط١٤٠٨/١، ١٩٨٨.

٩ـ البيهقي– سنن البيهقي الكبرى– مكتبة دار الباز / مكة المكرمة– ط /١٤٠٤– تحقيق: محمد عبد القادر عطا.

١٠ـ إبن الجاروود (عبد الله بن علي)– المنتقى من السنن المسندة – مؤسسة الكتاب الثقافية/ بيروت– ط١ /١٤٠٨– تحقيق: عبدالله عمر.

١١ـ إبن الجوزي (عبد الرحمن بن علي)– صفة الصفوة– دار المعرفة / بيروت– ط٢ / ١٣٩٩– تحقيق: محمود فاخوري، د.محمد رواس.

١٢ـ ابن الجوزي- الوفا بتعريف فضائل المصطفى ﷺ- دار المعرفة / بيروت.

١٣ـ الحاكم (محمد بن عبد الله الحاكم)- دار الكتب العلمية / بيروت-ط١ / ١٤١١- تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا.

١٤ـ إبن حبان (محمد بن حبان بن أحمد) -الثقات- دار الفكر/ بيروت- ط١/١٣٩٥/١٩٧٥- تحقيق: شرف الدين أحمد.

١٥ـ إبن حبان - صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان- مؤسسة الرسالة / بيروت- ط٢ / ١٤١٤- تحقيق: شعيب الأرنؤوط.

١٦ـ إبن حجر (أحمد بن علي)- الإصابة في تمييز الصحابة- دار الجيل/ بيروت- ط١/١٤٢١- تحقيق: علي محمد البجاوي.

١٧ـ إبن حجر - فتح الباري شرح صحيح البخاري- دار المعرفة / بيروت- ط/١٣٧٩.

١٨ـ إبن حزم (علي بن أحمد بن سعيد بن حزم) - جوامع السيرة- دار المعارف / مصر- ط١/١٩٠٠.

١٩ـ الحسن بن عمر بن حبيب- المقتفى من سيرة المصطفى ﷺ- دار الحديث / القاهرة-ط /١٤١٦ -تحقيق: د. مصطفى محمد حسين.

٢٠ـ إبن خزيمة (محمد بن إسحاق)- صحيح إبن خزيمة - المكتب الإسلامي/ بيروت- ط/١٣٩٠- تحقيق: د. محمد مصطفى الأعظمي.

٢١ـ أبو داود (أبو داود سليمان بن الأشعث السجستاني)- سنن أبي داود- دار الفكر/ بيروت- تحقيق: محمد محي الدين عبد الحميد.

٢٢ـ الذهبي (محمد بن أحمد)- سير أعلام النبلاء- مؤسسة الرسالة / بيروت- تحقيق: مجموعة محققين بإشراف شعيب الأرناؤوط.

٢٣ـ الذهبي- المعين فى طبقات المحدثين- دار الفرقان / عمان- ط١/١٤٠٤- تحقيق: د. همام عبد الرحيم سعيد.

٢٤ـ الرئاسة العامة لإدارات البحوث العلمية والإفتاء والدعوة والإرشاد– مناظرة بين الإسلام والنصرانيية– ط١/١٤٠٧.

٢٥ـ إبن سعد (محمد بن سعد بن منيع) – الطبقات الكبرى– دار صادر/ بيروت– ط١/١٩٦٨– تحقيق: إحسان عباس.

٢٦ـ السفاريني (محمد بن أحمد بن سالم) – لوامع الأنوار البهية وسواطع الأسرار الأثرية–مؤسسة الخافقين/ دمشق– ط٢/١٤٠٢.

٢٧ـ الشوكاني– نيل الأوطار من أحاديث سيد الأخيار شرح منتقى الأخبار– إدارة الطباعة المنيرية.

٢٨ـ طارق محمد امعيتيق – تقريب الوصول إلي معرفة الرسول ﷺ– بنغازي/ ليبيا– ط١/٢٠٠٧.

٢٩ـ الطبراني (سليمان بن أحمد)– المعجم الكبير– مكتبة العلوم والحكم/ الموصل– ط٢ /١٤٠٤– تحقيق: حمدي السلفي.

٣٠ـ الطبري (محمد بن جرير الطبري) – تاريخ الأمم والرسل والملوك– دار الكتب العلمية / بيروت– ط١/١٤٠٧.

٣١ـ الطبري– تفسير الطبري (جامع البيان في تأويل القرآن)– مؤسسة الرسالة / بيروت– ط١ /١٤٢٠– تحقيق: أحمد محمد شاكر.

٣٢ـ الطبري –خلاصة سيرة سيد البشر– مكتبة نزار مصطفى الباز / مكة المكرمة– تحقيق: طلال بن جميل الرفاعي.

٣٣ـ عبد الباسط بن خليل – غاية السول في سيرة الرسول ﷺ– تحقيق: د. محمد كمال الدين– عالم الكتب / بيروت– ط/١٤٠٨.

٣٤ـ عبد الرحمن بن عبد السلام – نزهة المجالس ومنتخب النفائس– دار المحبة / بيروت– تحقيق: عبد الرحيم مارديني.

٣٥ـ إبن عساكر– الأربعين في مناقب أمهات المؤمنين– دار الفكر/ دمشق– ط١ / ١٤٠٦– تحقيق: محمد مطيع الحافظ، غزوة بدير.

٣٦ـ إبن عساكر- تأريخ دمشق- دار الفكر/ بيروت- ط١/ ١٤١٩/ ١٩٩٨.

٣٧ـ القرطبي (محمد بن أحمد)- الإعلام بما في دين النصارى من الفساد والأوهام- ط / ١٣٩٨-دار التراث / القاهرة- د. أحمد حجازي.

٣٨ـ القرطبي- تفسير القرطبي (الجامع لأحكام القرآن)- دار إحياء التراث العربي/ بيروت.

٣٩ـ إبن القيم (محمد بن أبي بكر)- مؤسسة الرسالة / بيروت- ط١٤/١٤٠٧- تحقيق: شعيب الأرناؤوط، عبد القادر الأرناؤوط.

٤٠ـ الكتاني (عز الدين بن جماعة)- المختصر الكبير في سيرة الرسول ﷺ- دار البشير/ عمان-ط/١٩٩٣- تحقيق: سامي مكي العاني.

٤١ـ ابن كثير (إسماعيل بن عمر بن كثير القرشي)- البداية والنهاية- مكتبة المعارف / بيروت.

٤٢ـ إبن كثير- تفسير القرآن العظيم- دار طيبة/ -ط ٢/١٤٢٠- تحقيق: سامي بن محمد سلامة.

٤٣ـ إبن ماجة (محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني)- دار الفكر/ بيروت- تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي.

٤٤ـ الماوردي- الحاوي الكبير- دار الفكر/ بيروت.

٤٥ـ المباركفوري (محمد عبد الرحمن عبد الرحيم) - تحفة الأحوذي بشرح جامع الترمذي- دار الكتب العلمية / بيروت.

٤٦ـ المزي (يوسف بن الزكي عبد الرحمن)- تهذيب الكمال- مؤسسة الرسالة/ بيروت- ط١ /١٤٠٠- تحقيق: د. بشار عواد معرووف.

٤٧ـ مسلم (مسلم بن الحجاج بن مسلم)- صحيح مسلم- دار الجيل/ بيروت.

٤٨ـ المناوي (زين الدين عبد الرؤوف المناوي)- التيسير بشرح الجامع الصغير- مكتبة الإمام الشافعي/ الرياض- ط٣/١٩٨٨.

٤٩ـ ناصر بن علي عائض– عقيدة أهل السنة والجماعة في الصحابة الكرام– مكتبة الرشد/ الرياض– ط٣ /١٤٢١.

٥٠ـ النسائي– سنن النسائي الكبرى– دار الكتب العلمية / بيروت– ط١/١٤١١– تحقيق: د.عبد الغفار سليمان, سيد كسروي حسن.

٥١ـ أبو نعيم (أحمد بن عبد الله بن أحمد) – معرفة الصحابة– دار الوطن / الرياض– ط١/ ١٤١٩– تحقيق: عادل بن يوسف العزازي.

٥٢ـ النووي (يحيى بن شرف)– المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج– دار إحياء التراث العربي/ بيروت– ط٢/١٣٩٢.

٥٣ـ إبن هشام (عبد الملك بن هشام بن أيوب)–السيرة النبوية– دار الجيل / بيروت– ط/١٤١١– تحقيق: طه عبد الرؤوف.

٥٤ـ الهيثمي (نور الدين علي بن أبي بكر)– مجمع الزوائد ومنبع الفوائد– دار الفكر/ بيروت– ط/١٤١٢/١٩٩٢.

٥٥ـ وزارة الأوقاف والشئون الإسلامية / الكويت– الموسوعة الفقهية الكويتية– دار السلاسل / الكويت– ط/١٤٠٧.

٥٦ـ أبو يعلى (أحمد بن علي بن المثنى الموصلي)– مسند أبي يعلى– دار المأمون للتراث / دمشق– ط١/١٤٠٤– تحقيق: حسين سليم أسد.

# ناوەرۆک:



گرنگیی ئەم پەرتووکە لەوەوە سەر چاوە دەگرێت کە وەڵامێکی زانستی و بابەتییانەیە بۆ هەموو ئەو کەسانەی بە شوێن راستیی رووداوەکاندا دەگەڕێن و هەوڵ دەدەن وەک چۆن روویان داوە، یان وەک چۆن گوتراوە، ئاوا لێی تێبگەن، نەک وەک خەڵکانێک کە بۆ مەرامی بەدی خۆیان بە ئاوەژووەوە باسیان لێوە دەکەن.

لەم پەرتووکەدا ئەوپەڕی هەوڵم داوە کە وەکو توێژەرێک بە شێوەیەکی بابەتییانە و دوور لە هەموو سۆزێک، یان کاردانەوەیەک قسە لەسەر بابەتەکان بکەم.

د. خالید موحەممەد ساڵح

رەواندنەوەی گومانەکان

لە بڵاوکراوەکانی رۆژنامەی کۆمەڵ

ژمارە ( 12 )